ناوی کتێب: **لە مەککە**

نووسەر: **قادر عەبدوللا**

وەرگێڕانی لە هۆڵەندییەوە: **شەفیقی حاجی خدر**

بابەت: **ڕۆمان**

نۆبەتی چاپ: یەکەم، ٢٠١٨

بەرگ: **ئازاد وەرتی**

چاپخانە: **حەمدی**

نرخ: چوار هەزار دینار

ژمارەی سپاردن: لە بەڕێوەبەرایەتی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان - هەرێمی کوردستان ژمارەی سپاردنی «٢٤٨»ی ساڵی ٢٠١٨ی پێدراوە.

"کاتێک ژیان دەرفەتێکت دەداتێ، بە هەردوو دەستەکانت بیگرە و سەریشی بۆ دانەوێنە."

منیش ئەوەم دەزانی، بەڵام لەگەڵ ئەم کتێبەدا، ئەزموونی تایبەتی خۆم هەیە.

# پێشباری وەرگێڕ

دوای وەرگێڕانی شاکارەکەی «**خانووەکەی مزگەوتێ**» و بەر لە وەرگێڕانی «**خەتی بزماری**»، لە ڕێی هێژا «**عەلی کەریمی**»دا پەیوەندییم لەگەڵ کاک «**قادر عەبدوللا**»ی نووسەر پەیداکرد. ئەوەبوو، نامەیەکی ئەو، کە تایبەت بوو بە وەرگێڕانی «**خەتی بزماری**» لەسەر بەرگی کتێبەکەدا بڵاوم کردەوە. پارهاوینیش کە ڕێم کەوتە هۆڵەندا، سەردانێکی نووسەرم کرد، بە یاوەری «**شێخ شەماڵ گەزنەیی**» لە شاری «دێلفت» لەگەڵی دانیشتن.

لە سەرەتای دانیشتنەکەدا، بەو قسەیەم زۆر دڵخۆش بوو، کاتی گوتم؛ "نەوەک هەر بە ناوی خۆم، بەڵکو بە ناوی بەشێک لە خوێنەرانی کورد، ئەوانەی کتێبەکانی تۆیان خوێندۆتەوە، سڵاوت لێدەکەم و دەستت دەگوشم". ئەویش لە بەرانبەردا، بوخچەی ڕێز و خۆشەویستی بۆ کورد کردەوە و باسی یەکەمین کتێبی خۆی بە فارسی، کە لە ژێر ناوی «کردها چ میگویند» بوو، کرد.

ئینجا لە درێژەی قسە و باسدا پێمڕاگەیاند، من بە تەمای وەرگێرانی کتێبی دیکەی ئەوم، بە تایبەتی ڕۆمانی «پاشاکە» کە ڕۆمانێکە لەسەر ناسرەدین شای قاجارە، ئەویش دلخۆشبوو، پێشنیازی ئەوەی بۆ کردم بەڵکو کتێبی «کلیلە و دیمنە»شی وەربگێڕم، بەڕای ئەو، خوێندنەوە و وەرگێرانی کتێبەکەی «ابن المقفع» بە عەرەبی ئاسان نییە و هەندێک ئاڵۆزە، ئەو ڕاستەوخۆ لە فارسییە کۆنەکەدا وەریگێڕاوەتەوە سەر هۆڵەندی و لە ژێر ناونیشانی «مانگا»دا بڵاوی کردۆتەوە. سەبارەت بە ناونیشانەکەش، ئاماژەی بە ڕەگوڕیشەی چیرۆکەکە دا... ئەوەی ڕاستی بێ، بۆ وەرگێرانی هەردوو کتێبەکە، پلانم هەیە، لەوانەیە ڕۆمانی پاشاکە پێشتر بکەوێ... با بزانین داهاتوو چی لەبن سەردا دەبێ!

کاتێکیش پرسیاری پڕۆژەی ئایندەم لێکرد، ئەو باسی دوو کتێبی کرد، کەوا لە کۆتایی ساڵدا (٢٠١٧) دەردەچن. لێرەدا ئیستێکی کرد و ڕووی تێکردم، و پێیگوتم: "پێمخۆشە ڕۆمانە تازەکەم کە بەناوی «بەرەو مەککە»یە بکەیتە کوردی، چونکە باسی کوردانیشی تێدایە و چیرۆکێکی سەرنجڕاکێشە."

دانیشتنەکەمان زۆر خۆش بوو، باسیماڵبەتەکەی خۆشی بۆ کردین، بە تایبەتی ژن و هەردوو کچەکانی، کە باپیرە و داپیرەیان کوردن و خەڵکی کرماشان و سنەن و کوردیش دەزانن.

دواتر کە هاتمەوە و لە کۆتایی ساڵدا، لە ڕێی ئینتەرنێت، ڕۆمانەکەم بینی، بەڵام بە ناوێکی دیکەوە بوو، بە ناوی «پەردەکە» بوو.

نامەم بۆ نووسی، لەوەڵامدا پێیگوتم؛ ناوەکەی گۆڕیوە، بۆ خوێنەری هۆڵەندی وای پێباش بووە، کە ناوی پەردە بێ، بە تایبەتی کە پشت پەردە شوێنی گێڕانەوەی حەکایەتەکانی دایکی بووە، نەخاسمە خەون و خەیاڵی پشت پەردەی کەعبە!

ئەوکات بۆ ماوەی چەند مانگێک لەبەر داخرانی گەشتی فڕۆکەی ڕاستەوخۆ، نەدەکرا بە ئاسانی کتێبەکەیم پێبگا. هەر بۆیە کتێبەکەی بە پی دی ئێف بۆ ناردم، بۆ ناونیشانەکەش، بۆی نووسیم، ناوی ڕۆمانە تازەکەی ئەمە «لە مەککە».

ئەم ڕۆژانەی دواییشدا، لە وەڵامی چەند پرسێکمدا، نامەیەکی دیکەی بۆ ناردم، دەقی نامەکەش وەک خۆی بڵاوکراوەتەوە، لەوێدا چەند سەرەداوێکی تایبەت بە ژیاننامەی خۆی و پەیوەندی بە کورد تێدایە.

ئێدی خوێنەری بەڕێز، ئەمە، چیرۆکی وەرگێڕانی تازەترین ڕۆمانی کاک «قادر عەبدوڵڵا»یە. ئەمجارەیان وەرگێڕانە کوردییەکە پێش وەرگێڕانی ڕۆمانەکانی دیکە دەکەوێ!

له کۆتاییدا هیچم نەماوەتە بڵێم، تەنیا ئەوەندە نەبێ، کە ناکرێ ئاماژە بە هەوڵ و شەونخوونی خۆشەویستانم نەکەم، وەک چۆن لە وەرگێڕانەکانی دیکەمدا، یارمەتیان داوم، ئەمجارەش بە هەمان تینوتاو، لە بارەی پێداچوونەوە، هەڵەبڕی و کۆمەڵێ پێشنیازی بەجێ سەبارەت بە ڕێنووس و دەستەواژە دارشتن، بە هانامەوە هاتن. بۆیە ڕێگەم بدەن لە بری ئێوە سوپاسی هەر یەک لە «**شێخ شەماڵ، لوقمان شلانی، بارام سوبحی، کاروان عارف، ئەژین مام محەمەد، ڕۆژان مام محەمەد**» بکەم. هەڵبەتە سوپاس و پێزانیم بۆ کتێبخانەی «زەیتون»یش لە هەولێر، کە لە ماوەی ئەو مانگ و نیوەی وەرگێڕانەکەدا، ماڵی دووەمم بوو، سوپاس بۆ بەڕێوبەر و گشت کارمەندەکانی، کە وەک میوان نا، بەڵکو وەک کارمەندێکی خۆیان لەگەڵم جووڵانەوە.

هەڵبەتە هاوسەری خۆشەویستیشم «**کنێر جەمیل خەیلانی**» لەماوەی وەرگێڕانەکەدا، دەرفەتێکی باشی بۆ ڕەخساندم.

هەر بە ڕێکەوتیش دارشتنی ئەم چەند دێڕانەی پێشبار، کەوتنە یادێکی مەزن و پرشنگدار، یادی ساڵوەگەڕی ڕۆژی ڕۆژنامەگەری کوردی.

هیوادارم ئێوەش، لە سەرنج و تێبینییەکانتان بێبەشم نەکەن.

ش. ح. خ

هەولێر، ٢٢-٤-٢٠١٨

# نامەی نووسەر بۆ وەرگێڕ

تێبینی: لە نامەیەکدا چەند پرسیارێکم ئاراستەی ڕۆماننووس کرد، بەوەی بەڵکو کورتەیەک لە مێژووی ژیانم بۆ بنووسێ، هەروەها چەند دێڕێکیش بۆ سەر بەرگەکە، لەگەڵ ئەوەی داوام لێکردبوو کە بۆم ڕوون بکاتەوە، ئاخۆ «ڕەفیق فوئاد»، شاکەسەکەی نێو کتێبی «قەلەکە» کێیە؟

وەڵامی ئەویش ئەمەی خوارەوە بوو:

ئازیزم شەفیق،

سەلام،

سوپاس بۆ ئیمێڵ و خۆتەرخانکردنت بۆ وەرگێڕانی کتێبەکانم.

ئەمەی خوارەوە وەڵامی پرسیارەکانتە.

شتێکی ناوازەیە کە بەم شێوازە، کتێبەکانی من دەخەیتە بەردەم خەڵکی کورد.

ئا- سەبارەت بە مێژووم، پێشتر لە کتێبەکانمدا نووسیومە. هەر بۆ نموونە، کتێبی «خەتی بزماری» چیرۆکی ژیاننامەی خێزانەکەمە، هەروەها «خانووەکەی مزگەوتێ»ش بەشێکی زۆر لە مێژووی خۆم وماڵباتەکەم دەگێڕێتەوە.

من لە خانەوادەیەکی دیندار، لە شارستان گەورە بووم. باوکم کەڕولاڵ بوو، لەگەڵ ئەودا هەمیشە هەر بە زمانی ئاماژە دواوین. لە ماوەی خوێندنی زانکۆمدا، ڕشتەی فیزیا لە تاران، سەروکارم لەگەڵ بزووتنەوەی بەرەنگاری خوێندکاراندا پەیداکرد. سەرەتا دژی شا وەستاینەوە، پاشان دژی ڕژێمی

ئایەتوڵلاکان. لە کۆتایی هەشتاکاندا (سەدەی ڕابردوو)، لەوێ هەڵاتم و لە ڕێی ئەستەمبولیشەوە گەیشتمە هۆڵەندا و لێی گیرسامەوە.

لە هۆڵەندا خەونێکی نوێم بۆ هات، بەتایبەتیش بەوەی ببمە نووسەرێکی گەورەی هۆڵەندینووس. ئینجا کەوتمە سەر فێربوی زمانی هۆڵەندی، هێشتاشی لەگەڵدابێ، بۆ بەدیهێنانی ئەو خەونە هەر تێدەکۆشم.

ب- شتێکی زۆر جوانە، کە بەم شێوازە کتێبەکانم دەکەونە بەردەستی خوێنەرانی کورد. ئاخر ئەوان خەڵکێکی نایابن، هیوادارم چێژ لە خوێندنەوەیان ببینن. سڵاوم بۆ خوێنەرە کوردەکانم هەیە. باپیرە و داپیرەی کچەکانم کوردن و خەڵکی «کرماشان» و «سنە»ن. کەواتە ئێمە کوردمان خۆش دەوێن. جوانی و دڵڕفێنی کوردستانیش لە ڕووخساری کچەکانمدا دەبینمەوە.

پ- ئەو کەسایەتییەی لە نێو کتێبەکانمدا هەن، توخمگەلی ژیانی منیان تێدایە. هەروەها «ڕەفیق فوئاد»یش. ئاوارەیی، خێزان و نووسەرایەتی لێرەدا نموونەن. ڕاستییەکەی ئەوەیە، کەسایەتی «ڕەفیق فوئاد»یش هێمایەکە بۆ قادر عەبدوڵلا.

ت- «لە مەککە»، کتێبێکە چەندین ڕەهەندی هەن، هەروەک ڕوونە جیهانی جیاواز جیاوزی تێدایە، کە دایکم خۆی تێدا دەبینێتەوە. چیرۆکەکان ڕۆڵێکی گرنگیان هەیە، چونکە چوارچێوەی شەقڵی مێژووی نێوان دایک و کوڕەکەی دارِشتووە. هەر کاتێک بەیەک دەگەن، ئەو یادەوەرییانە بە شێوەکی زیندوو، سەرهەڵدەدەنەوە. هەموو ئەوانە لە گەشتێکی ناوازەدا خۆیان دەبیننەوە، ئەمەش بە تێهەڵکێشی ڕەهەندی فەنتازیایی کە لە دارشتەی ڕۆمانێکدا خۆی دەبینێتەوە.

قادر عەبدوڵلا ٣-٤-٢٠١٨

## ١

# دایکەکان و هەگبەکانیان

**لەو** دواییانەدا و هەر کاتێک دایکم بە تەلەفۆن قسەی لەگەڵدا دەکردم، دەگریا؛ هەر دەیگوت و دەیگوتەوە، دەیەوێ تەنیا یەک جاری دیکە بەر لەوەی دوامالئاوایی لە دنیا بکا، بمبینێتەوە. هەر لەو کاتەی لە نیشتمان هەڵاتم، هەرگیز بۆی نەگەڕاومەوە، ئاخر ئەوە کارێکی نەکردە بوو.

یەک جاریان، ئەویش بەر لە پازدە ساڵ بوو، دایکم لەگەڵ باوکمدا بۆ سەردانمان هاتنە ئەمستردام. ئەو سەردانەیان دنەی ئەوەی دام چەند چیرۆکێک بنووسم و یەکەمین ڕۆمانی هۆڵەندی زمانیشم بەناوی "سەفەری بوتڵە بەتاڵەکان" نووسی.

ئەمجارەشیان دایکم دەیەویست بێتەوە، سەرمان لێبداتەوە، بەڵام من ئەمەم بە ڕەوا نەدەزانی و ترسەکەشم بێ بناغە نەبوو. ئاخر ئەو ئێستا پیر بووە، وای لێهاتووە ناسک بێ، دەترسام هەمان ئەو شتەی بەسەر بێ، کە بەسەر دایکی «ناسر»دا هات. «ناسر»یش کۆنە هاوڕێیەکمە. دوو ساڵ پێش ئێستا، دایکە پیرەکەی بۆ سەردان بانگهێشتی هۆڵەندا کرد. سەفەرەکەی سەفەرێکی تاقەتپڕوکێن بوو، چونکە دەبوایە لەو شوێنەی لێی دەژیا، شەش سەعاتی ڕێک لەناو ترومبێل بێ تا دەگەیشتە تاران، لەوێشەوە گەشتێکی دوورودرێژ بەنێو فرۆکەخانە و پاشان شەش سەعاتی دیکە تا دەگەیشتە هۆڵەندا. دوای ئەوەش دەبوایە لە سخیپول[21] ماوەیەکی زۆر لە نۆرەی

---

[1] Schiphol سخیپۆل فرۆکەخانەی ئەمستردامی پایەتەختی هۆڵەندا. و

2

پشکنین و ئاسایش و پۆلیسی گومرگ لە چاوەڕوانی هەگبەکانیدا بوەستێ. ئەمەش سەرباری ئەوەی، لە بارێکی دەروونی پڕتاسە و پەرۆشیدا بوو بۆ بینینی کوڕەکەی، تا بۆ دواجار هەم ڕۆڵەکەی و هەم بووک و هەم نەوەکانیشی ببینێ.

دایکە پیرەکانی کۆچبەران، بەزۆری لەبن باری گرانی ئەو تاسە و مەراقەدا دادەهێزرێن.

«ناسر»یش بە خۆیی و دەسکە تولپێکی[3] هۆڵەندی ڕەنگینەوە لە سخیپۆل چاوەڕێی دایکی کرد تا گەیشت و ئینجا لەگەڵ خۆی بردییەوە ماڵ. سەعات نۆی شەو ئەوسا گەیشتنەوە ماڵێ. ئەو پیرەژنە بەستەزمانە زیاتر لە بیست و چوار سەعات بە ڕێگەوە بوو. ئیدی ئەوان لە کەشێکی ئاهەنگئامێزدا نانی شێوانیان خوارد. پیرە دایکەکە هەگبەکانی خۆی کردنەوە و دیاری و یادگاری کە لەگەڵ خۆی هێنابوو، بەسەر هەمووان‌دا دابەش کرد.

لەڕاستیدا چیرۆکی هەگبەکان، چیرۆکێکی کۆنە و هەموو کۆچبەران پێی ئاشنان؛ ئەوە هەر دایکەکانن بە خۆیان و هەگبە پڕ دیارییەکانیان، دوای گەشتێکی دووروودرێژ و بە هیلاکی و کەنەفتی کورت دەکەون. هەگبەکان سەرچاوەی خەمن، زۆر مایەی ناسۆرە ئەگەر هاتوو لە ڕێگەدا ونی بکەن. ئاخر چۆن دەبێ ئەو دایکانە بە دەستی بەتاڵەوە سەردانی ڕۆڵە و نەوەکانیان بکەن؟

ئەو پیرەدایکەی هاوڕێکەم، تا درەنگانێکی شەو لەگەڵ ماڵباتەکەیدا بێدار مایەوە، تومەز باس هەر باسی مەرگی مێردەکەی، باسی دەرودراوسێ و باسی ژنی پیرەدەرمان و بەهاراتفرۆشەکە هەر نەدەبڕایەوە. کاتژمێر

---

[3] Tulp جۆرە گوڵێکی هۆڵەندییە لە مێلاقە دەچێ.

گەیشتبووە یەکی نیوەی شەو کاتێ ناسر پیلی دایکی گرت و بە پەیژە باریکەکان، یارمەتی دا تا بگاتە ژووری نووستن کە لە نهۆمی سەرەوە بوو. لە ژووری لێمانەوەدا، گڵۆپی شەوانەی داگیرساند، یەک پەرداخە ئاویشی لەسەر کۆمۆدینەکەی تەنیشت پێخەفەکە دانا، لێفەی بەسەردا دا و پێشیگوت، کە ئاودەست لە کوێیە. پاشان هەگبەکەی خستە بن پێخەفەکە و گڵۆپەکەی کوژاندەوە و گەڕایەوە ژووری نووستنی خۆی و ژنەکەی.

بۆ بەیانی لە جاران زووتر لە خەو هەڵسا، بە هێواشی لە پەیژەکان هاتە خوار، چایەکی تایبەتی بۆ دایکی لەسەر ئاگر دانا تا دێم بکێشی، ویستی جارێ ڕۆژنامە بخوێنێتەوە تا دایکی لە خەو هەڵدەستێ. ئەو چەند جارێک گوێی هەڵخست، بەڵام هیچی نەبیست، هیچ هەستوخوست لە ژوورەکەی سەرەوە نەدەهات. تۆ بڵێی بە هۆی گۆڕینی کاتەوە دایکی زیاتر لەنێو جێگەدا بە خەوتوویی مابێتەوە؟ لەکۆتاییدا چووە سەرێ و بە نەرمی لەپشت دەرکەکەی وەستا و بانگی کرد: "دایکە، ڕۆژ بەترێک لە ئاسمان ڕاکشاوە. ئەرێ هەڵنەستاوی؟"

بەڵام خۆ دایکی هیچ وەڵامی نەدایەوە. ئەو جارێکی دیکە لە دەرکەی دایەوە: "دایکە، من دەمێکە چایەم لە دێم ناوە، وای لێهاتووە زۆر بکوڵێ و نەخورێتەوە."

هێشتاش هیچ کاردانەوەیەک پەیدانەبوو. ئینجا ترسی لێنیشت. «ناسر» بە هێواشی دەرکەکەی کردەوە. دایکەکە بە ئاسوودەیی خۆی لەناو پێخەفەکە ڕاکشابوو، نەیدەویست هەڵسێتەوە، هەرگیز نەیدەویست جارێکی دیکە بە ئاگا بێتەوە.

کۆنە هاوڕێکەم، دنیادیدە بوو، زانی دایکی تەواو بووە و پێویست ناکا بشڵەژێ. ئەو کاتی خۆی وەرگرت، لە تەنیشت تەرمی دایکی دانیشت و بە

بێدەنگی گریا. پاشان ژنەکەی ئاگادارکردەوە، کە تازە بۆ سەر کارەکەی ڕۆیشتبوو. دواتر زەنگی بۆ پزیشکی خانەوادە لێدا و سەرلەبەر چیرۆکەکەی بۆ گێڕایەوە. پزیشکەکەش بە پیر بەنگییەوە هات و تەرمەکەی پشکنی و مردنەکەی پشتڕاست کردەوە.

خۆ ئەگەر ئەو ڕوداوە لە نیشتمان ڕووی بدابایە، ئەوا دەستبەجێ «ناسر»ماڵبات و دەرودراوسێی لێ ئاگادار دەکردەوە. خزم و خۆیش ڕاستەوخۆ دەهاتن و باقی ڕێوڕەسمەکەش بەگوێرەی دابونەریت بەڕێوەدەچوو. مردووەکەیان دەخستە نێو دارەبازێک و دەیانگەیاندە مزگەوت، پاشان هەموو گەڕەکەکە لەگەڵی دەچوونە سەر گۆڕستان.

پزیشک هۆڵەندییە خانەوادەییەکەش یەکسەر زەنگی بۆ پۆلیس لێدا، پۆلیسیش لە ڕێی خۆیەوە پەیوەندی لەگەڵ دەزگای گومرگ و ئاگرکوژێنەوەدا کرد. خۆی دەبوایە تەرمەکە بۆ توێکاری ببردرێ.

هاوڕێ دێرینەکەشم ماتەم و دڵبەخەم لە تەنیشت تەرمی دایکەکەی دانیشتبوو، لەو کاتەدا کرێنی ئاگرکوژێنەوە گەیشتە شەقامەکەیان. دوو کارمەندی ئاگرکوژێنەوە بە خۆیان و یەکبەرگی فەرمییان، بە دەستکێش و دەمپۆشێک، لەپشت پەنجەرەکە و لەو بڵندایە لە هەوا دەرکەوتن. ئەوان ئاماژەیان بۆ «ناسر» کرد، دەبێ پەنجەرەکە بکاتەوە. ئەویش نەیدەزانی چی ڕوویداوە و هاواری کرد: "بۆچی؟"

ئەو دەبوایە خۆی بداتە لایەک، تەرمەکە لە پەنجەرەکەوە دەهێندرایە خوار و سێ هەفتەش لەنێو سارنجەکەی[4] تایبەت بە مردووان مایەوە، تا ئەو

---

[4] مەبەست ئەو شوێنە تایبەتییە بەر لە ناشتن کە بۆ چەند ڕۆژێک تەرمی تێدا هەڵدەگیرێ تا بۆن نەکا.

کاتەی «ناسر» سندووقی تەرمەکەی دەناردەوە ولآت.

منیش ئەم دۆخەم بۆ دایکە پیرەکەم نەدەویست. بیرم لە شتێکی دیکە کردەوە، بەڵکو ئەو گەشتە دورودرێژەیان لە کۆڵ بکەمەوە.

## ٢

# شتێکی دیکە لە ئارادا بوو

لە خوشکە بچووکەکەم زانی، کە دایکم لەپڕێکەوە تووشی داوی دەردی مێشکئالۆزی هاتووە، هەر لە هیکەوە وای لێهاتووە، کاتێ لەماڵ دەردەچێ، ڕێگەی ماڵەوە نازانێ بێتەوە: "وا باشترە تۆ خێرا ببینی، دەنا دواتر وای لێدێ تۆش نەناسێتەوە."

منیش بیرم کردەوە، وام پێباشتر بوو، لە یەکێ لە وڵاتە دراوسێکانی ئێران، چاوم بە دایکم بکەوێ، ئەو وڵاتانەی کە پێویستی بە ڤیزە نەبێ. بیرم لە تورکیا، تاجیکستان، ئەرمەنستان و جۆرجیا کردەوە، بەڵام لە پڕێک، ژنەکەم پێیگوتم: "باشە بۆ نەچینە «دوبەی». لەوێوە بۆ دایکت بە فڕۆکە هەر چل خولەکێک دەبێ. وێڕای ئەمەش، خۆ برازاکەم و خێزانەکەی لەوێ دەژین. ئەوێ زۆرباش دەبێ، لەوێ بە هۆی دیتنی دایکیشتەوە کەسوکاریش دەبینین، هەموو بەیەکەوە دەبین."

هەرچی من بووم، نەمدەویست بچمە «دوبەی». ئاخر هەر لە خۆوە دژی شارەکە بووم. پێموابوو ئەوێ کۆمەڵگەیەکی دەستکردە، کلتوورێکی ساختەیان هەیە، توورەگە لمێکی بێ مێژووە، شوێنێکە نە زمان، نە وێژە، نە موزیک نە شانۆی تایبەتمەندی خۆی هەیە نە هیچ. هەمیشە شارەکە منی دەهێنایە سەر کەڵکەڵەی دارودرەخت و گوڵی نایلۆن و دەستکرد. ئاخر من دووجار چووبوومە ئەوێ، بەڵێ هەر لەبەرئەوەی برازای ژنەکەم لەوێ دەژیا، ئەو کەسەی هەر لە کاتی خوێندکاریمدا، دەمناسی. ئەو ئێستا لە «دوبەی» کاری دەلالی دەکا.

"دەی وەرە، دە تۆ وەرە، خۆ هەر ناتوانی بچیتە ئێران، دەی وەرە با کەمێک پێکەوە بین،" هەمیشە کاتێ ئەو خزمەم زەنگی لێدەدا، هەر وای پێدەگوتم؛ "دەی جارێ واز لە کتێبەکانت بێنە، ئەرێ تا کەی هەر پێیانەوە دەنووسێی، هەر دادەنیشی و دەنووسی، دەی پشوویێک بە خۆت بدە، دەنا ئاگات لە خۆت نامێنێ و پیر دەبی و چیدی یەکدی نابینینەوە."

لە سەردانی یەکەممدا، ئەوێم پێ هیچ نەبوو، تەنیا خۆرەتاوێکی گەرم، تەنیا ڕۆژە گەرمەکەم پێخۆش بوو. لەوێدا کارخانەی گەلێ زۆر، تەلار و باڵەخانە، ترومبێلی قەبەقەبە، سوپەرمارکێتە هەرە گەورەکان، ئینگلیز، ئاڵمان، کۆچبەر، شێخ، خواردنگە ماکدۆنالدەکان، جانتای ژنانەی گوسی،[5] قایشی گرانبەها، بۆن، قاوەخانەی ستاربێکس، مزگەوت، ڕۆلس ڕۆیسی گەورزۆنە گەورزۆنە، دەڵاڵەکان، کرێکار، ژنە تایلەندیم بینین ئەوانەی وەک منداڵ خەڵکی ئەوێ بەخێو دەکەن. قەحپەی ڕووسی، ملیۆنێرە عێراقی و ئێرانی و دەوڵەمەندە سعوودییەکان کە ئازادانە بە پارە زۆروزەوەندەکەی وڵاتەکەیان لەوێدا ڕایاندەبوارد، بەڵێ لەوێ هەموو ئەوانەم بینین.

بۆ جاری دووەمیش هەر سەردانی ئەو خزمەمان کردەوە. ئەمەش لەو کاتەدا بوو، کە قەیرانی ئابووری جیهانی لە ئارادابوو. «دوبەی»یش کەوتبووە ڕەوشێکی سەیروسەمەرەوە. بۆرسەکەی ئەوێ ئەوەندە دابەزیبوو، وایلێهاتبوو بگوترێ هەرگیز وەک خۆی لێنایەتەوە. هەموو چالاکییە ئابوورییەکانی وڵاتەکە وەستابوون، چیدیکە تەلارە بەرزە هەوربڕەکان دروست نەدەکران، پرۆژەی نیشتمانی میترۆش ساردی تێکەوتبوو، خاو بەڕێوە دەچوو، لەکاتی خۆی تەواونەدەبوو. لەو نابووتییەی تووشی بازاڕی کڕین و فرۆشتنی خانووبەرە بوو، بە دەیان پرۆژە

[5] هەکبەی گوسی Gucci جۆرە هەکبەیەکی ژنانەی گرانبەهایە.

قەللۆش[6] ببوون و بە هەزاران لە ئێرانی، عێراقی، پاکستانی و سعوودی کە لەسەر کاغەز باڵەخانە نوێکانیان کڕیبوو، کەچی پارەکەیان پێنەدەدرایەوە. وردە کاسبکارەکانی وڵاتە دروایسێکانیش کە سەرمایەگوزارییان لە «دوبەی» کردبوو، ترومبێلە گرانبەهاکانیان هەر لە پارکی فڕۆکەخانەکان بەجێهێشت و بە خۆشیان تێیان تەقاند و لە وڵاتەکە هەڵاتن، تا ئەو قەرزانەی لەسەریان بوو، نەیدەنەوە.

بەڵام لە سۆنگەی ئەو ملیارد دۆلارە قەرزەی «ئەبو زەبی» وەریگرتبوو، «دوبەی» توانی دیسان سەرپێ بکەوێتەوە و جارێکی دیکە هەڵسێتەوە. میری «دوبەی» بە خۆی وەزارەتێکی نوێی بۆ کابینەی حکوومەتەکەی خۆی داهێنا و وەزیرێکی بەناوی وەزیری بەختەوەری دەستنیشان کرد. ئەویش ڕاسپێردرا کە شارێکی بەختەوەر بۆ گەشتیاران دروست بکا.

ئیدی لەو بارودۆخەدا بوو، گەشتەکەم بۆ دوبەی ڕێکخست، تا لەوێ بە دیداری دایکم شاد ببم، ئەوەش بەرلەوەی نەبادا وای لێبێ چیدیکە نەمناسێتەوە. دواتر دەبینین ئاخۆ من لەوەدا لەسەر هەق بووم، کە ئەوێ ئەو شوێنە نموونەییە نەبوو، دیدارێکی وا گرنگی تێدا بکرێ.

ئیدی بەم جۆرە، بۆ جاری سێیەم بەرەو ئیمارات بەڕێکەوتم.

ئەوەی کارئاسانی بۆ بڕیارەکەم کرد، کە بچمە «دوبەی»، ئەوە بوو نووسینگەیەکی گەشتیاری لە تاران ئەو جۆرە گەشتانەی بە ئاسانی ڕێکدەخست. ئەو نووسینگەیە تەنانەت خزمەتگوزارییەکی تایبەتیان بۆ تەمەندارەکانیش هەبوو، بە تایبەت ئەوانەی دەیانەویست لە «دوبەی» بە دیداری ڕۆڵەکانیان بگەن. تۆ پارەکەت دەدا و ئەوانیش هەموو شتێکیان

---

[6] قەللۆش: نابووت، ئیفلاس.

ڕێکدەخست. ئەوان هەر بە خۆیان پیرەکانیان لە دەرکی ماڵەکانیانەوە دەگەیاندە فڕۆکەخانە، مشووری هەگبەکانیان دەخواردن، ئەوانیان دەخستە نێو ترومبێلێکی تایبەتمەند و تا فڕۆکەخانە نەدەوەستان. کاتێکیش لە فڕۆکەخانەی «دوبەی» دادەبەزین، دەلاڵەکانی هەمان نووسینگەی گەشتیاری، گەشتیارەکانیان دەگواستنەوە دەرەوەی فڕۆکەخانە، لەوێش کۆستەرێک بۆ گواستنەوە چاوەڕێیان دەکرد. هەر لەوێ یارمەتی ئەو دایبابە پیرانەیان دەدا و سواری مینی پاسەکەیان دەکردن و دەیانگەیاندنە ئەو هوتێلانەی کە پێشتر بۆیان گیرابوو.

هەر بەڕاستی ئەمە شتێکی نموونەیی بوو، بۆیە خەمم نەما.

خزمەتێکی دیکە کە نووسینگەی گەشتیاری بۆی سازاندبوون، ئەوە بوو، پاکێجێکی تەواوی بیمەی گەشتیارەکانی تێدابوو. ئەو مەعمیلە پیرانە لە هەموو لایەکەوە بە بیمەی نەخۆشی و هەر ڕووداوێکی سەفەر ڕووپۆش کرابوون. خۆ ئەگەر یەکێک لە گەشتیاران بمردبا، ئەوا هەر بەگوێرەی دابونەریتی کە لە هۆڵەندادا هەبوو، ڕاستەوخۆ بەرەو ئەو گۆڕستانەیان دەگواستەوە کە پێشتر داوایان کردووە؛ هەموو تێچوونێکیش هەر لەو بڕە پارەیەی گەشتەکەدا بوو، کە پێشتر درابوو.

بۆ منیش ئەمە دووشەش بوو.

ژنەکەم هەموو شتێکی لەڕێی برازاکەی ڕێکخست. نووسینگەی گەشتیاری ئێران-دوبەی مشووری هەموو شتێک دەخوا و دایکم دەگەیەنێتە دوبەی.

دەستبەجێش بیرم لە خوشکە بچووکەکەم کردەوە. ویستم ئەویشی لەگەڵدا بێ.

## ٣

# خوشکەکەم و یەکەمین کتێبی فارسیم

**باوکم** کەڕولاڵ بوو، من لە کتێبی «خەتی بزماری»[7]دا بە دووروودرێژی باسی ژیانەکەیم تێدا نووسیوە. من نۆبەرە بووم، من بۆ خۆم نەبووم، بەڵکو بۆ باوکم بووم، یان لەڕاستیدا بۆ دایکم لە دایک بووم. ئاخر ئەو پیاوێکی پێویست بوو، تا لە ماڵەوە جێگەی باوکم بگرێتەوە.

ئەو کاتەی هێشتا مێردمنداڵ بووم، باوکم وای ڕەفتار لەگەڵ دەکردم، کە پیاوێکی هەراش بم، وەک ئەوەی هەموو شتێک بزانم و هەموو شتێکیشم پێبکرێ. ئەو خۆی دەخستە بەردەستم، وای فێرکردم کە بڕیاربدەم و ئەویش دوام بکەوێ. دایکیشم بە شێوازێکی دیکە، هەر وای دەکرد. هەر زووو دایکم وەک ڕۆڵەیەکی خۆی لێم دوورکەوتەوە، وەک سەرداری ماڵێ لێیدەڕوانیم.

بە بیرم نایەتەوە، ئاخۆ دایکم لە ماوەی تافی منداڵێتیمدا، منی لە باوەش گرتبێ. ئەو هەمیشە بە ڕێزەوە سەیری دەکردم، وەک ئەوەی پیاوێک بم، مەودایەک خۆی لێ بەدوور دەگرتم.

من ئەوە ناڵێم، کەوا دایکم ئەم کارەی بە ئەنقەست یان بە مەبەست کردبێ. کارەکە هەر خۆی وا ڕۆیی، دیاربوو سروشت ئەو بڕیارەی دابوو. ئەم حاڵەتەش لە هەموو ئەو ماڵباتانەدا ڕوودەدا، کە یەکێ لە دایبابەکان

---

[7] خەتی بزماری، ڕۆمانێکی تێکەڵاوی یاداشتنامەی نووسەرە، لە ٢٠١٧دا وەرمگێڕا و ناوەندی ڕۆشنبیریی ئەندیشە چاپ و بڵاوی کردەوە.

کەمئەندام بن. لەو جۆرە خێزانانەدا، یەکێ لە منداڵەکان، بە زۆریش وایە، کوڕە گەورەکەیان، ئەو ئەرکەی دەکەوێتە ئەستۆ.

ئێمە لە خانووێکی گەورەدا و لەگەڵ پێنج منداڵی دایبابم و حەوت منداڵی مامەکەمدا دەژیاین. ئەوەش لە ڕێی دایبابی باوکم و مامە هەرە گەورەکەم وا ڕێککەوتبوو، بۆئەوەی بەردەوام چاوی لە سەر باوکم بێ. ئیدی ئێمەی منداڵ، یەکمان بەو جۆرە نەدەبینی کە پسمام و دۆتمامی یەکدی بین، بەڵکو وەک خوشک و برا وابووین. هەر بەم جۆرەش، وەهام دەڕوانییە مامم کە باوکی ڕۆحی و نموونە و سەرمەشقی من بێ.

لە ماوەی ئەو هەموو ساڵانەی ماڵ، من هەر بۆ خۆم ڕۆژژمێرێکم هەبوو، تیایدا هەموو شتێکی خۆم دەنووسییەوە. لە ماوەی خوێندنی زانکۆشمدا، ئاشنایەتیم لەگەڵ بزووتنەوەیەکی گەریلایی پەیداکرد و بوومە نووسەری ڕۆژنامە ژێرزەمینییەکەیان.

لەمیانەی شۆڕشەکەشدا[8]، کورد سوودیان لە پاشاگەردانی وڵات بینی و داوای سەربەخۆیی خۆیان کرد. ئینجا شەڕ لەنێوان کورد و حکوومەتە نوێیەکەدا هەڵگیرسا. لەو ماوەیەدا، من وەک پەیامنێری ئەو ڕۆژنامە ژێرزەمینییە، گەشتێکم بەنێو ناوچە شەڕەکانی کوردستاندا کرد. دوای ئەوەی پاش چەند مانگێک گەڕامەوە تاران، لەپاڵ ئەو وتارانەی بۆ ڕۆژنامەکەم نووسیبوو، کتێبێکیشم بەناونیشانی "کوردەکان چی دەڵێن[9]؟ یان "کوردەکان چیان دەوێ؟" نووسی.

---

[8] مەبەست شۆڕشی گەلانی ئێرانە لە ١٩٧٩دا. و.

[9] مەبەست یەکەمین کتێبی نووسەرە بە فارسی بەناوی "کردها چ میگویند". و.

کتێبەکە نۆبەرەی نووسینەکانم بوو، بەڵام خۆ هیچ وەشانخانەیەک نەیدەوێرا چاپ و بڵاوی بکاتەوە. ئەوسا منیش بەناوێکی خوازراو و بە نهێنی بڵاوم کردەوە، بەتایبەتیش لەو کاتەدا لە میدیای فەرمییەوە، هیچ دەربارەی کورد نەدەگوترا و نەدەنووسرا.

ئەمەشیان لە یەکێک لە کتێبە سەرەتاییەکانمدا باسکردووە، بەڵام هەنووکە و لێرەدا، شتێکی دیکە هەیە، تا ئێستا باسم نەکردووە.

لەو کاتەی بۆ خوێندن چووبوومە تاران، ژوورەکەم لەماڵی باوانم وەک خۆی مابوو، دەستی لێنەدرابوو. من دەستنووسی کتێبە قەدەغەکراوەکەم سەبارەت بە کورد، لە ژوورەکەم لە ماڵی باوانم شاردبووەوە، چونکە پێم گوناح بوو بیسوتێنم، بەتایبەتیش چونکە من لە کوردستان هەموو شتێکم، هەموو تێبینی و سەرنجەکانم بە دەستخەت نووسیبوونەوە. کەچی خوشکە شازدە ساڵییەکەشم، دەستنووسەکە لە ژوورەکەمدا دەدۆزێتەوە و دەیخوێنێتەوە، پاشان دەیداتە «جەواد»ی پسمامم. «جەواد»ی تەمەن بیست و یەک ساڵەش، منی وەک براگەورە و نموونەی سەرمەشق تەماشا دەکرد. منیش ئەوم هەروەک برا دەبینی.

بەڵام لەو نێوەدا و لەو بێنەوبەرەیەدا لەپڕ شتێک ڕوویدا، کە من لێی ئاگادار نەبووم.

«جەواد» دوای ئەوەی دەستنووسەکەمی خوێندبووەوە، هەروەک من بە نهێنی سەفەرێکی بە کوردستاندا کرد. ئەویش هەر هەمان ڕێگەی منی گرتبووەبەر، کە لە کتێبەکەدا باسم کردبوو. ئەو چەندین وێنەشی گرتبوون، لە هەندێک لە وێنەکاندا لەگەڵ پیاوانی چەکدار، بەخۆیان و تفەنگەکانیان لەسەر تانکەکان وەستابوون.

من هەمیشە کاتێک دەگەڕامەوە شارەکەم و سەرم لە دایک و باوکم دەدا، خۆپارێز و وریا بووم. حیسابی ئەوەم کردبوو، ئاژانەکانی دەزگای هەواڵگری نهێنی لەپڕ و لەنیوەی شەودا بۆ گرتنم بەسەر ماڵی باوکم دابدەن. بۆیە دەرکەم دووجار قفڵ دەداو پەیژەیەکیشم بەسەر بانەکە هەڵدەنا، بۆ ئەوەی لەکاتی تەنگانە و ناچاریدا خۆم دەرباز بکەم.

لە یەکێک لەو شەوانەی سەردانی ماڵی باوانم کردبوو، لەسەر پێخەفەکەم ڕاکشابووم و شتێکم دەخوێندەوە، بەڵام هەر هێندە بوو، گوێم لە تەپەی پێ بوو، لەپشت دەرکەی ماڵمانەوە هات. ئیدی هەر زوو پاڵتۆیەکەم کردەوە بەر و چاوەڕێم کرد. زەنگی ماڵەکەمان لێدرا. دایکە هەمیشە بێ ئۆقرەکەم دەگەیشتە ژوورەکەم و بە زمانی ئاماژەی باوکمەوە پرسی، ئاخۆ چی بکەین. منیش هەر بە ئاماژەوە، وەڵامم دایەوە، نابێ یەکسەر دەرگەکە بکەیتەوە، بەڵکو لە پشت دەرکەدا بپرسی، ئاخۆ کێیە لە دەرکە دەدا.

ئەویش چووە لای دەرکە و پرسی : "ئەوە کێیە؟"

پیاوێک لەپشت دەرگەکەوە هاواری کرد: "پۆلیس! دەی دەرکە بکەوە!"

منیش دەستبەجێ دەستم دایە جانتاکەم، بە پەیژەکە هەڵگەڕام، بەسەر بانەوە لە ڕێی ماڵە دراوسێکانەوە هەڵاتم، لەوێشەوە بازمدایە سەر شەقامەکە و بەو تاریکییە ڕامکرد، لەوکاتەشدا دوو هەیتە بە بێهودە لە دوورەوە بە دوام کەوتن.

من زانیم چۆن ڕابکەم و لەبەردەستیان قوتاربم، بەڵام خۆ هەیتەکان سەروبنی ماڵەکە بە دوای مندا گەڕان.

ئەوکات شتێک قەوما کە مۆرێکی لە هەموو ژیانی من داو ئاراستەی ژیانیشمی بە تەواوی گۆڕی.

بۆ گەڕان و سوڕان و دۆزینەوەی بەڵگەنامە لەسەر من، ژوورەکەمییان پشکنی و کتێبەکانیان هەڵگێر و وەرگێڕ کرد و بە گۆڕێیان وەرکردن. پاشان چوونە ژووری خوشکەکەم، کەلوپەلەکانی ئەوێندەرێش گەڕان، پێخەفەکەیان وەرگەڕاند، لەوێدا لەنێو چەکمەجەیەکدا شتێکیان دۆزییەوە، کە نەدەبوو هەرگیز لەوێدا بوایە: ئەویش دەستنووسی ئەو کتێبەم بوو کە لەسەر کورد نووسیبووم.

«جەواد»ی پسمامم، کە دایکم ئاگاداری کردبووەوە، هەوڵیدا هەڵبێ، بەڵام سەرنەکەوت و لەڕێگە تووشی دوو ئاژان هات. ئەویان لەگەڵ خۆیان بردەوە ژوور تا هۆدەکەی بپشکنن. لەوێشدا شتێکی دیکە ڕوویدا، کە نەدەبوایە ڕووبدا. ئەوان هەموو ئەو وێنانەیان دۆزینەوە کە لەکاتی گەشتەکەی بۆ کوردستان گرتبوونی، هەموو ئەو وێنانەی لەگەڵ پیاوە چەکدارەکان و تانکەکان کەوتنە بەردەستیان.

ئاژانەکان ویستیان خوشکم و کوڕە مامەکەم کەلەپچە بکەن و لەگەڵ خۆیان بەرن، ئیدی لەو کاتەدا شتێک لە ماڵەکەدا تەقییەوە.

دایکم دەیزانی کە خوشکم و جەواد ناوە ناوە بە شەو لە ماڵ دەردەچن و بە بۆیە دروشم دژی ڕژێم لەسەر دیوارەکان دەنووسن. یەک دوو جاریش ئاگاداری کردبوونەوە، کە نابێ ئەو کارە بکەن، بەڵام نەشیدەتوانی ڕێگەیان پێبگرێ. ئینجا کە هەیتەکان سەرتاپای ماڵەکە گەڕان، دایکم ئەو قووتوە بۆیانەی بە دزییەوە بردبووە گەرماوەکە تا لەوێ لەناویان بەرێ. نامرادانە هەوڵیدابوو بە چەکوچ لێیانبدا و بیاندڕێنێ و سپراکەیان تێدا نەهێڵێ، بەڵام بۆ یەکێک لە قوتووەکان بەڕوویدا ناتەقێتەوە. ئینجا دەستبەجێ لەگەڵ بیستنی دەنگەکە، ئاژانەکان دەست بۆ چەکەکانیان دەبەن و بەرەو سەرچاوەی دەنگەکە غار دەدەن. لەوێدا دایکم دەبینن بێهۆش لەو گۆڕە

لەسەر ناوکەوی گەرماوەکە کەوتووە. سەر و جەستە و دەستەکانی هەمووی بۆیەی سوورە.

ئاژانەکان دایکیشمیان بۆ لێکۆڵینەوە لەگەڵ خۆیان ڕاپێچ کرد و برد.

هەموو ئەم شتانەش لەکاتێکدا ڕوویدا، کە جەنگی نێوان ئێران و عێراق لە گەرمەی خۆیدا بوو، ئەوکات سەدام بەشی خوارەوەی ئێرانی داگیرکردبوو، هەڕەشەی لە ڕژێمە نوێکەی ئێران دەکرد. هەر بۆیەشە ڕژێم زەبروزەنگی زۆری بەکارهێنا، هەر هەوڵێکی دژبەر سەری هەڵدابا، هەر لە جێوە سەرکوتی دەکرد. لەو ماوەیەدا یەک دوو هەزار کەس لەسێدارە دران، هەر هەمووشیان گەنجی پەرۆش و بێ ئەزموون بوون، ئەوانەبوون نەیاندەویست کڕنووش بۆ مەلایەکان ببەن.

من ئەو بەسەرهاتانەم لە کتێبەکانی بەراییمدا یاداشت کردوون، بۆیە لێرەدا زۆر لەسەریان ناڕۆم. بەڵام خۆ هەر دەبێ بە کورتی باسی هەندێکیان بکەم.

«جەواد» دوای هەفتەیەک لە گرتن، لەبەرئەوەی دژی ڕژێمی ببووەوە، لەسێدراە درا؛ نەوەک هەر ئەوەندە و بەس، بەڵکو نەدەبوایە لە گۆڕستانی ئاساییشدا بنێژرێ؛ ئیدی بە ناچاری لە پاشخانی باخێکی خانەوادەکە، لەنێو شاخدا بە خاک سپێردرا، لەوێ لە شوێنێکی دیار لەبن داربادامەکان گۆڕی بۆ لێدرا.[10]

هەفتەی دوای ئەو، زەنگی تەلەفۆن بۆ ماڵی باوانم لێدرا. یەکێ لە پیاوانی زیندانەکە بە دایکمی گوتبوو، خوشکەکەم هەر ئەمشەو لەسێدارە دەدرێ،

---

[10] شایانی باسە لە شاکارەکەی «خانووەکەی مزگەوتێ»دا کە لە ٢٠١٧دا لە ناوەندی ئاوێر چاپ و بلاو کردایەوە، بە وردی وێنای ئەو حاڵەتە کراوە. و.

بۆیە با یەکێک بۆ بەیانییەکەی بچێت و تەرمەکەی بباتەوە. مامیشم تاکەکەس بوو، بەم ئەرکە هەڵبستێ.

منیش نەمدەتوانی لەو کاتەدا خێزانەکەم بۆ بەختی خۆی جێبێڵم، هەر دەبوایە لەگەڵیان بووبام. ئاخر خۆ خوشکەکەم بە هۆی منەوە خرابووە کونجی زیندان و شتێکی نارەواش بوو، من لە کونجی عافیەت لە تاران لێیدابکوتم. بە خۆیشم نەمدەویست خوشکەکەم لە شوێنێکی دوورەدەستی کێوەکان گۆڕغەریب دەرچێ. ئاخر خۆ من سەرداری ماڵ بووم و دەبوایە بڕیار بدەم. بۆیە بڕیارمدا تەرمی خوشکەکەم هەر لەماڵ و لەناو حەوشەکەدا بنێژرێ.

بۆ ڕۆژی پاشتر، کاتێک مامم بە خۆی و ترومبێلێک بۆ زیندانەکە دەکەوێتە ڕێ، تا تەرمەکەی لەگەڵ خۆی بێنێتەوە، من لە حەوشەی ماڵ، گۆڕێکم لەبن دار فستقەکە هەڵکەند.

بەڵام خۆ شوکور، مامم بە ترومبێلی بە تاڵەوە گەڕایەوە لامان.

خوشکم بەر لێبوردنی کەمکردنەوەی سزا کەوتبوو.

جەوادی پسمامم مایەی خەم و ماتەمم بوو. دەستم بە نووسین کرد، شەوو ڕۆژ هەر دەمنووسی، بەڵکو شتێک بکەم، بەڵام تێبینیم کرد، هەرگیز قەرەبوو ناکرێتەوە.

خوشکەکەشم مایەی ژان و ئازارمە، ئەو ئێستا بۆتە دایکی دوو منداڵی هەراش، بەڵام لە یادەوەری مندا هەمیشە ئەو کیژە شازدە ساڵیە ماوەتەوە، هەرگیز نەگۆڕاوە.

دوای ئەو هەموو ساڵانە، بە تامەزرۆییەوە ویستم بیبینمەوە. هەر بۆیە ئەوەم ڕێکخست، ئەویش لەگەڵ دایکم بێتە «دوبەی».

٤

## له دوبەی

**ژنەکەم** لەڕێی برازاکەیەوە پارەکانی بە شێوەی ئەلکترۆنی دا، بۆیە پێویست نەبوو، هیچ خەمی چۆنیەتی پارەدانەکە بخۆم. لەسەرێکەوە من دڵخۆش بووم، کە هەموو شتێک ڕێکخرابوو، بەڵام لە سەرەکەی دیکەوە، هەندێک سەبارەت بە نووسینگە گەشتیارییەکەوە بە گومان بووم. هەر بەتەنیا ئەوەش نەبوو، بەڵکو متمانەم پێیان نەبوو. لەوە دەترسام نووسینگەی گەشتیاری، بەڵێنەکەی خۆی بەجێنەهێنێ، ئەو پارەیەی هەنووکە دابووم، حاشای لێبکرێ و هەر بە بەلاش بچێ. ئاخر ئەو جۆرە نووسینگە گەشتیارییانە، بە باشی لەوە شارەزابوون، بابایەکی وەک من، کە نەیدەتوانی بگەڕێتەوە نیشتمان، ئامادەبوو پارەیەکی زۆر بدا، بۆ ئەوەی بە دیداری دایبابی شاد ببێتەوە. ئەوان دەیانزانی، ئەو جۆرە دیدارانە، زۆر سۆزداری و هەستیارن، چونکە زۆر جاران دەبووە دوا دیداریان.

بەڵام خۆ من بژاردەیەکی دیکەم لەبەردەستدا نەبوو، زۆریش پەرۆش و پرسەن بووم، بۆیە بە هەستێکی تێکەڵە لەگەڵ ژنەکەمدا ملی ڕێگەی «دوبەی»مان گرتەبەر.

بە قەولی خودی نووسینگە گەشتیارییەکە، سویتێکی گەورەی سێ ژووریيان لە هوتێلێکی نایاب و نوێ و کەشخە، لە هوتێلی «شێخ زاید» لەسەر ڕێگەی «شێخ زاید»دا بۆ ئێمە گرت، بۆ ئەوەی هەفتەیەک تێیدا بمێنینەوە. بەڵام هەرچەند بەڵێنیان پێدەداین، ئەوەندە من بەگومان دەبووم: ئاخر سێ پێخەفی شاهانەی نایاب، ناندینێکی گەورە بە دەزگەی جلشۆر، بە دەزگەی جل وشککەرەوە و قاپشۆریشەوە، بە سێ گەرماوەوە، وێرای

ئەوەش بە ژەمە خواردنێکی بەیانیانی شازادەییەوە، هەمووی هەر بەو برە پارەی کە دابوومان، مایەی تێرامان بوو. خۆ ئەگەر من هوتێلێکی وەهام لە رێی هۆڵەنداوە بەرادان بدابایە، سێ ئەوەندەی تێدەچوو. ئاخر کێ نالێ ئەو نووسینگە گەشتیارییە لەو نرخە گونجاوانەی پێی راگەیاندووین، پاشگەز نابێتەوە، دواتر لەبەردەم دایکم و خوشکم تووشی شەرمەزارییم ناکا.

بەڵام خۆ کارەکەم هەر کردووە، هەر دەشبێ ئۆباڵی لێکەوتەکانی بە خۆم هەڵبگرم.

فرۆکەی سەر بە KLM [11] لە فرۆکەخانەی نێودەوڵەتی «دوبەی» نیشتەوە. منیش بەرەو هۆڵی هەگبەکان رۆیشتم، تا جانتاکان هەڵبگرم، رادەی وروژاوی ساتەکەش هەر بەرەو هەوراز هەڵدەکشا.

ژنەکەم لە هەفتەکانی پێشتردا، بەخۆی و لیستێک شت چووبووە بازاڕ، بۆ ئەوەی بۆ هەموو کەسوکارەکان، سەر و دیارییکی هۆڵەندییان بۆ بکرێ. بۆ دایکیشم گەشتەکە، گەشتی ژیان بوو، بۆیە نەدەکرا بە دەستی بەتاڵ بگەرێتەوە ماڵ. بەگوێرەی خووخدەی خۆشمان، دەبوایە بۆ هەر ئەندامێکی ماڵباتەکە دیاری بباتەوە.

لە دەرەوەی فرۆکەخانەش، تاکسییکم راگرت و یارمەتی شوفێرە پاکستانییەکەم دا، تا هەگبە قورسەکان بخاتە پشتەوەی ترومبێلەکەی. پاشان لەگەڵ ژنەکەم سوار بووین و بە لێخورەکەشم گوت: "بمانگەیەنە هوتێلە کەشخە و مۆدێرن و پاشاییەکەی «شێخ زاید» لە رێگەی شێخ زاید."

---

KLM [11] ناوی کۆمپانیای هێڵی ئاسمانی پاشایەتی هۆڵەندییە. و.

تاکسیەکەش کەوتە جووڵە. ئیدی گەشتە سەرچڵییەکەی ئێمەش دەستی پێکرد.

دوا نیوەڕۆیەکی درەنگ بوو، زۆریشی پێنەچوو کە سیمای تەلارە بەرزەکان لە دوورەوە دەرکەوتن، ئەو تەلارانەی بە ترومبێلی کەشخە و قەبەوە دەورەدرابوون، بەتایبەتیش بۆ «دوبەی»، عەرەبستانی سعوودی، کوێت و باقی میرنشینەکانی دیکە دروست کرابوون. ڕاکێشانی هێڵی میترۆ کە لەکاتی تەنگژەی ئابوریدا، وەستابوو، دیاربوو تەواوکرابوون، چونکە قیتارەکان بە بەرزییەوە دەهاتن و دەچوون، لە وێستگەیەکی نایاب بۆ ئەویدیکە دەڕۆیشتن. ئای کە منیش حەزم لێبوو جارێک سواری ئەو میترۆیانە ببم و بەناو شارەکەدا بگەڕێم. ئەو کات دەتتوانی بە یەکجار هەموو تەلارە هەوربڕەکان ببینی. لەوانەیە ئەمە بیرۆکەیەکی باشیش بێ، تا لەگەڵ دایکم گەشتێکی وا بکەین.

لەوانەیە ئەو کورتە گەشتە میترۆییە، تاکە شتێک بێ لە دوبەیدا بتوانم لەگەڵ دایکمدا بیکەم. هەر بۆیە دیسان کەمێ لێوی پەشیمانیم گەزت، کە ئەوانم بۆ ئێرە هێنان. من لەپێش چاوی خۆمدا دەمبینی، چۆن لە مۆڵێکی گەورەوە بۆ یەکێکی دیکە دەڕۆین. لەمەش زیاتر هیچی دیکە نەبوو، ئای لەم بیرۆکە هەراسانییە.

ئاخر لە دوبەیدا هیچ شوێنێکی وای لێنەبوو، کە بەیەکەوە و بە ئاسوودەیی پیاسەی تێدا بکەین. ئەمەشم لە دوو سەردانەکەی پێشوترمدا دەزانی. خۆ ئەگەر بۆ پیاسەیەک چووبامە دەر، لەوە زیاتر نەبوو کە جارێکی دیکە بە بەردەمی ئەو بازاڕانەی کولوپەلی مێرکدارییان[12] دەفرۆشتن لەگەڵ

[12] مەبەست ئەو کالایانەیە کە نیشانەی کارخانە ڕەسەنەکانیان بەسەرەوەیە.

خواردنگە و شوێنی خواردنەوەدا تێپەڕ نەبم. هەمیشە هەر بۆن و بەرامەی مریشکی برژاو و هەمبەرگەرەکان لە خواردنگە خێراییەکاندا دەهات. خۆی زۆر باشتر بوو ئەگەر چووباینە تاجیکستان یان جۆرجیا، ئەو وڵاتانەی کە دایکم تێیدا وەک وڵات هەستی بە ئاسوودەیی دەکرد. لە «دووشەنبە»ی پایتەختی تاجیکستاندا، خەڵک بە فارسی دەدوێ، هەروەها لە هەموو شوێنێک، لەسەر شەقام تووشی ئێرانییەکان دەبوویەوە و بە باشیش پێشوازیت لێدەکرا، چونکە تۆ لە وڵاتێکەوە بۆ لای ئەوان چووبووی، کە وەک ئەوان قسەت دەکرد. ئێمە مێژوویێکی هاوبەشمان لەگەڵ ئەو وڵاتانەدا هەبوو، کاتی خۆیشی وەک یەکەیەک هەردوو لامان لە ژێر یەک فەرمانڕەوایەتی پاشا گەورەکانی ئێرانیدا بووین. خۆ «دوبەی»ش لە مێژووی کۆندا سەر بە ئیمپراتۆرییەتی فارسی بووە، بەڵام ئێمە ئەوێمان لەدەستدا و شێخەکانیش کردییانە شوێنێکی سەرنجڕاکێش.

هەڵبەتە ئێستاش بۆ ئەو جۆرە غەریبی و گومانانە زۆر درەنگە، مێژوو کاری خۆی کرد و بلیتی سەفەرەکەشمان بڕیبوو. خۆم بە خۆمم دەگوتەوە، ئارام بگرە و واز لەو دەردەدڵانە بێنە.

لەوەش زیاتر نەدەکرا، هەموو ئەو بەدگومانییەش لەوەڕا سەرچاوەی گرتبوو، کە دایک و خوشکم سێ ساڵ بوو نەمبینیبوون.

من پێشتر ئەوەم باسکرد، کە جارێکیان دایبابم هاتبوونە ئەمستردام، ئەوەش دوا دیدارم بوو لەگەڵ باوکم، چونکە دوای ئەوە زۆری نەخایاند، کۆچی دوایی کرد. ئەوەش بۆ من مایەی کەسەر و داخ بوو، لەو ڕۆژگارە سەختەدا نەمتوانی لای ئەو بم، تا بە زمانی ئاماژەوە کەمێک باری ئاڵۆزی جیهانی بۆ ڕوون بکەمەوە. ئاخر ئەو نەیدەزانی ئاخۆ بۆچی «جەواد» لە

سێداره درا، بۆچی خوشکم خرایه کونجی زیندان و بۆچی منیش هەڵاتبووم و هەرگیزیش بۆ ماڵ نەگەڕامەوە.

له «دوبەی»دا هەموو ئەو یادەوەرییانەم لێ ژیانەوە، منیش بە قووڵی کەوتبوومە نێو دەریای بیرکردنەوە، تا ئەو کاتەی تاکسییەکە لەسەر شۆستەی هوتێلەکەی شێخ زاید، کە شەست و پێنج نهۆم بوو، ڕاوەستا. سێ پاکستانی یان هیندستانی، کە کرێکاری هوتێلەکە بوون، بە جلوبەرگێکی یەکپۆشی کەشخە و بە بۆینباخەوە، دەمودەست بە پیرمانەوە هاتن و عارەبانەیەکیشیان هێنا و هەگبەکانیان خستە سەر و ئێمەیان بردە نێو هوتێلەکە.

دەمودەستیش تووشمان بوو بە تووشی دوو وێنەی گەورەی شێخ زاید بن سوڵتان ئال نهەییانی دامەزرێنەری دوبەی و شێخ محەمەد بن ڕاشد ئال مەکتوومی میری ئێستای، هەروەها ڕیزە وێنەیەکی دیکەش لە چوارچێوەی زێڕین هەڵواسرابوون، کە هی شێخەکانی دیکە بوون، من نەمدەناسین.

لەوێ لە پرسگەی هوتێلەکەدا قەڵەباڵغی بوو، خەڵکیش لە نۆرەی خۆیان وەستابوون تا لەو ژوورانەی بەڕادانیان دابوون، بپێچنەوە؛ بەڵام ئەوەی مایەی سەرسوڕمان بوو ئەوە بوو، کارمەندەکەی بەردەرکە پێیگوتم: "ئێوە پێویست ناکا لە نۆرەکەدا بوەستن. ژوورەکەی ئێوە لە ڕێی نووسینگەی گەشتیاری ئێران-دوبەی بەڕادان دراوە. هەموو شتێک ڕێکخراوە. دەکرێ بەدوای مندا بێن."

دڕدۆنگیەکەی منیش زیاتر بە پرسنی و سەرسامی وەرگەڕا. ژنەکەم زۆر بەو هەواڵە کتوپڕییە خۆشحاڵ بوو: "باشە چیمان لێدەکەن؟"

ئیدی چووینە نێو ئەسانسێرێکی پانوپۆڕی تازەوە، کە کامێرا و ئاوێنەدار بوو. دەرکەوانەکە کۆدەیەکی لەسەر تەختە کلیلەکەی ئەسانسێرەکە لێدا و

کابینەی ئەسانسێرەکە بە خێراییێکی زۆرەوە بەرەو هەوراز هەڵکشا. تا سێمان ژمارد، ئێمە گەیشتینە نهۆمی شەست و پێنجەمین، خەریکبوو بگەینە سەربانی ئەو هوتێلە کەشخەیە نمایشدارەی شێخ زاید. لەوێوە ئێمە دیمەنێکی زۆر جوانی دوبەیمان بە هەزاران هەوربڕی مۆدێرن لەبەرچاو بوو. هێشتاش دوو ڕووخساری وروژێنەری زێدەباری دیکە دیاربوون. لە حوکمی چاو لە دوورەوە کەنداوە شینەکەی فارسی هەبوو، لەڕاستیدا ئەمەش بۆ من واتای نیشتمانی دەگەیاند، لە پشتەوەش بیابانێکی پانوپۆڕ هەبوو، تا عەرەبستانی سعوودی دەکشا، کەواتە تا مەککە درێژ ببووەوە.

٥

# عەرەبەکان

بەر لەوەی بێمە سەر ئەوەی شتێک دەربارەی سویتەکە بڵێم، دەمەوێ شتێک ڕوونبکەمەوە، کە لەڕاستیدا لەجێگەی خۆشیدا نییە. هەر لەبەر ئەوەشە، پێداگیرم کە من ڕاسیست نیم و هەر واشم داناوە، مێژوو زۆر کارنەکاتە سەر بیروبۆچونم. من خۆم حەزم لە ئەدەبیاتی عەرەبیە، حەزم لە خواردنەکەیانە، حەزم لە کلتووری عەرەبییە، حەزم لە سەماکەرە سمت بادەرەکانیانە، حەزم لە ئافرەت و هەقایەتەکانیانە، هەڵبەتە حەزیشم لە زمانی عەرەبییە، کە ئەو هەموو شاکارە چیرۆکی بەشێوەیەکی دروست پێی گێڕدراوەتەوە و پێی نووسراوە.

ئێستاش کە ئەو قسانەی سەرەوەم گوتن، بە ئاسوودەیی دەتوانم قسەکانی دیکەی خۆم بکەم.

فارسەکانی ئێران نایانەوێ هیچیان لەگەڵ عەرەبەکاندا هەبێ. هەرچەندە ئەوەش ڕاست نییە، بەڵام ڕق و قینی ئەوان ڕۆچۆتە نێو هەستەکانیان لە بەرانبەر عەرەبستانی سعوودیەدا. نزیکەی هەموو هاونیشتمانیەکانم ئەو هەستەیان هەیە. هەر لە پاشاوە تا گەدا، هەر لە سەرکردەیەکی گەورەی ڕۆحییەوە تا مجێوری مزگەوتێ، لە ڕۆشنبیرێکی چەپگەراوە تا شاویست و ناسیونالیستێکی توندڕۆ، ئەمەش میراتێکی مێژووییە، هەرگیز دەستبەرداربوونی بۆ نییە، لەوەش گەڕێ کە لەناوبچێ. ئەمەش هەمووی لە چاوی ئیسلامەوە هاتووە، لەبەر ئەو شاڵاوی داگیرکردنەی عەرەبەکان کە ئێرانی کۆنیان لە ١٤٠٠ ساڵی ڕابردووەوە داگیرکرد.

عەرەبەکانی هەرێمی ئێستای عەرەبستانی سعوودی و لەبن بەیداخی محەمەدییدا بەسەر شانشینەکەی ئێمەیاندا دا و ئاگردانی پەرستگاکانیان لێ کوژاندینەوە، کۆشکەکانمانیان ئاگر تێبەردا، ئەلفبێیەکەمانیان گۆڕی و هی عەرەبییان لەجێ دانا و ناچاریان کردین قورئان لەبەر بکەین.

دوای ئەوە، هەرگیز پەیوەندییەکان لەنێوان ئەو دوو وڵاتەدا باش نەبوونەوە، وەک خۆیان لێنەهاتەوە. ئێستاش ئەو قێزلێبوونەوەیە ڕەگ و ڕیشەی خۆی داکوتاوە، ئاخر خۆ هیچ پیاوێکی فارس کیژەکەی خۆی ناداتە سعوودییێک. هەروەها هیچ کچێکی فارسیش بە خواستی خۆی نایەوێ ببێتە ژنی سعوودییێک.

من جارێکی دیکە لێرەدا پێ لەسەر ئەوە دادەگرمەوە، کە زۆر بە ئەدەبیاتی عەرەب سەرسامم، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا، منیش لە دژی دراوسێ سعوودیەکانمان، لەگەڵ ئەو مەیلە بێزارییەی مێژوودام. هەروەها منیش هەرگیز کیژی خۆ نادەمە سعوودییەکان، مەگەر خۆی وا داوابکا، خۆ ئەگەر واشی کرد، ئەوا لەوە بە گومان دەبم، ئاخۆ ئەوکات ئەو کیژی منە یان نا.

هەر لەو نێوەشدا ڕوداوگەلێکی سەیروسەمەرە لە کلتوور، لە ئەدەبیات و مێژوودا قەوماون.

ئەو ڕقە نیشتمانییەمان بە خەستی بەرانبەر وڵاتێک چڕکراوەتەوە، کە محەمەدی پێغەمبەر و قورئانی لێوە هاتووە. کەواتە دەبوایە، هەر بەو جۆرەش پێغەمبەر و قورئانەکەیشمان بێزراندبایە، بەڵام خۆ ئێمە ئەو پێغەمەرە عەرەبەمان بێئەندازە خۆشدەوێ. لایەنە تەوسداریەکە لێرەدایە، کەوا نزیکەی هەموو ژن و پیاوێکی فارس خەون بەوە دەبینێ، گەشتی مەککە بکا، بچێتە شاری ئەندێشاوی، بۆ ئەوەی کەعبە، ماڵەکەی ئەڵڵا بە پیرۆز ڕابگرێ. هەموو ساڵێک یەک ملیۆن ئێرانی دەچنە مەککە و لەوێشەوە

خۆیان دەگەیینە «مەدینە»، تا لەمزگەوتەکەی ئەوێدا و لەلای گۆڕەکەی پێغەمبەردا کڕنووش بەرن.

دایکیشم کەسێکی وەهایە، خەونی بەوەوە دەبینی، بەڵام هێشتا بۆی ڕێکنەکەوتووە گەشتی حەجەکەی بکا.

"ڕۆڵە، من خەریکە دەمرم و کەچی خەونەکەشم هەر نەهاتەدی." جارێکیان لە تەلەفۆن وای پێگوتم.

منیش دەمزانی هەرگیز خەونەکەی بەدی نایە، چونکە من لە ئەمستردام دەژیم و ئەویش پیر و کەنەفتە لە تاران. وێڕای ئەمەش، خۆ من نەمدەویست بچمە مەککە، لەژێر هیچ پاساوێکیشدا نەمدەویست یەک قرۆش (فلس) لە وڵاتێک خەرج بکەم، کە لەلایەن پاشایەکی سعوودیەوە فەرمانڕەوایی دەکرێ. حەیف بۆ دایکم.

من ئەمە بۆیە دەگێڕمەوە، تا ڕوونی بکەمەوە، کە چەند جارە بە نابەدڵی بەرەو دوبەی دەڕۆم، ئەو شوێنەی کە شێخ محەمەد بن ڕاشد ئەلمەکتوم، شێخ زاید بن سوڵتان ئال نهەییان و شێخ حەمدان بن حەمەد بن ڕاشد ئال مەکتوم و شێخ و سوڵتانەکانی دیکە حوکمڕانن.

ئەمجارەیان لەبەر خاتری دایکم سەفەرەکەم کرد. سەرباری ئەوەش، خۆ هیچ تاکە شێخێکی عەرەب لەنێو هوتێلەکەدا نابیندرێ. هەموو کارمەندەکانی، هەر لە دەرگەوانەکەوە بگرە تا بەڕێوبەری هوتێل، خەڵکی پاکستان، هیندستان، تایلەند و وڵاتی دیکەن. بێگومان خودانی هوتێلەکە هەر شێخێک بوو، بەڵام خۆ ئەو هوتێل و تەلاری هەوربڕی دیکەی هەن، بۆیە ناپەڕژێتە سەر[13] ئەو هوتێلە، کە ئێمەی لێدادەبەزین و هەرگیز لەوێ نەدەبیندرا.

---

[13] ناپەڕژێتەسەر: واتە کاتی ئەوەی نییە.

ئێستاش باسی سویتی هوتێلەکە دەکەم.

# ٦

## سویتەکە

ئێمە لە نهۆمی شەست و پێنجدا جێمان گرت، لەڕاستیدا وەک بانی هوتێلەک وابوو، منیش لەگەڵ ئەو دوو دیمەنە تەلیسماویەدا ڕۆیشتم، کەنداوی فارس و ئەو بیابانە کاکی بەکاکییە، کە بە کەعبە، بە ماڵی ئەڵڵا کۆتایی دەهات.

دەرگەوانەکە لەگەڵمان هات و دەرکەی سویتەکەی بۆ کردینەوە و ئێمەش لێ وەژوورکەوتین. دەمودەست شتێکی ناوازە بوو. هەر زوو خۆت لەبیر دەکرد، کە لە «دوبەی» بی، بەڵکو وات دەزانی تۆ لە خانوویێکی کلاسیکی فەرەنسی کەشخە و نایابدا گیرساویتەوە، کە لەسەر شێوازی بێلە ئۆپیکو[14] بوو. تەنانەت دۆلابێکی قەبەی کتێبیشی تێدابوو، پڕ لە کتێبی فەرەنسی بوو. سوویتەکە سێ ژووری گەورەی نووستنی تێدا بوون، هەریەکەشیان گەرماوی خۆی هەبوو، ناندینێکی هاوچەرخانەشی هەبوو. نابێ ئەوەش لەبیر بکەین، نووسینگەیەکی تێدابوو، لەسەر مێزەکەشی کۆمپیوتەرێک داندرابوو، ڕووەکەی لە سەر کەنداوی فارسییەوە بوو.

لەوانەیە ئەو دیمەنە تێکەڵەیەی نووسینگەکە و ئاراستەی ڕووەکەی، بۆ نووسینی کتێبێکی نوێ دەستی بدابایە. چونکە هەر کە دەرگەوانەکە ئێمەی بەجێهێشت، یەکسەر کۆمپیوتەرەکەم کردەوە و دەستم بە نووسینی ئەم کتێبە کرد.

[14] Belle epoque

ژنەکەم دڵخۆش بوو: ئێمە سەرچڵێتکمان کرد و شایستەش بوو. ئێمە لەگەڵ نووسینگەیەکی گەشتیارییدا خۆمان فرێدایە نێو زێ، ئاخر تۆ بلیتی شتێکت بڕیوە کە نەتدەزانی لەبەرانبەریدا چی وەردەگریتەوە.

تا ئێرە هەموو شتەکان تەواوعەیار بوون، بەڵام لە قووڵایی ناخمدا دەترسام نەوەک بە داوەوە ببم، دەترسام نەوەک پاش کەمێکی دیکە، کارمەندی نووسینگەی گەشتیارییەکە بە خۆی و لیستێکی تێچوونی قەبەقەبەوە بەسەرماندا بدا، بە جۆرێک هەرگیز نەتوانم دایکم بێنم و ئەو هەموو پارە ڕەچاونەکراوەیەم پێنەدرێ. من پیاوێکی بە ئەزموون بووم، لە ژیانمدا زۆر شتم دیبوو. ئاخر من بەرهەڵستی دوایین شا و ڕژێمی ئایەتوڵلاکانم کردبوو، لە جەنگی هەشت ساڵەی نێوان عێراق ئێراندا ژیابووم و دەربازیش ببووم، من هەلاتبوم، بۆ ماوەیەکی زۆر لە ئۆردوگای پەنابەراندا بووم و زمانی هۆڵەندی فێرببووم، بەڵام هەنووکە هەستم دەکرد، منداڵێک بم و چاوەڕێی دایکم بکەم. تۆ بڵێی بگات؟ تۆ بڵێی بیهێننە ئێرە؟ ئەرێ کە بمبینێ، چی بکا؟ تۆ بڵێێ ئەو گەشتەی لەگەڵ نەخۆشی وڕێنەکردن و لەبیرچوونەوە، بە باشی بڕوا؟

خۆی ئەوە گەشتێکی زۆرپێویست بوو، دەبوایە منیش بە لێکەوتەکانی قایل بم. هەر بۆیە بە بەختەوەری یان بە بەدبەختی لەپشت کۆمپیوتەری سویتە کەشخەکەی سەر بانی شەست و پێنجەمین نهۆمی هوتێلەکە دانیشتم.

هەر لەنێو سویتەکەدا، دووربینێک لە لای پەنجەرە گەورەکەدا داندرابوو تا پێی تەماشای دەریا بکەی. منیش دەستم دایێ، سەیری کەنداوی فارسیم کرد. خۆ لەپشت دوورابیەکەوە، کە زۆریش نەبوو، نیشتمانەکەم لەوێ بوو، ماڵەکەم ئەوەندە نزیک، کەچی دەستم نەدەگەیشتێ.

لەو دیو ئاوەکەوە، لەو شوێنەی کە وەک هێڵێکی تارماویی دیاربوو، ڕۆژێک لە ڕۆژان مامۆستای فیزیا بووم. ئەو مامۆستایەتییەشم ڕووپۆشێک بوو، تا لەوێ، لە بەندەرەکەدا هۆبەیەکی پارتەکەمان بکەینەوە و کاروبارەکانی هەڵبسوڕێنین.

قوتابخانەکە لە دەو زێ بوو. هەندێ جار ئەوەندە گەرم بوو، قوتابییەکانم دەردەهێنا و تەختەڕەشەکەشمان لەگەڵ خۆمان دەبردو دەچووینە سەر ئاوەکە، لەوێ بە بازنەیەک لە دەوری یەکدی دادەنیشتین و دەرسمان دەخوێند. ئەوێ ڕۆژێ هەرگیز ئەوەم بەبیردا نەدەهات، کە ڕۆژێک لەڕۆژان و بە دووربین و لە جامی پەنجەرەی هوتێلێکی ئەودیو ئاوەکەوە، لە «دوبەی» سەیری بەندەرەکە بکەم.

وەک هەر پیاوێکی ماندووی دەستی گەشتێکی دوورودرێژ، مەیلم لێبوو بگەڕێمەوە ماڵەوە.

لەوێوە چوومە لای پەنجەرەکەی دیکە و بە دووربین لە بیابانم ڕوانی. ئێستا تاریک داهاتبوو و هیچیش نەدەبیندرا، بەڵام خۆ لە کۆتایی بیابانە پانوپۆڕەکەدا شاری مەککە هەبوو. لەوێدا ئەوەم دەهێنایە پێشچاوی خۆم، چۆن کەعبە، ماڵەکەی ئەللا، لەوێ لەنێو ئەو هەموو چراخانەدا دەبریسکێتەوە.

زۆریش بەرگەم نەگرت، دووربینەکەم لەسەر تارمەی پەنجەرەکە دانایەوە و چوومە خوارێ، چوومە پرسگەکە، تا بزانم ئاخۆ کەی دایکم دەگا.

## ٧

# ڕێبەری کەشتیاری ئێران - دوبەی

چوومەوە نێو ئەسانسێرەکە و بە یەک دوو چرکە گەیشتمە نهۆمی زەمینی. هێشتاش لەوێ هەر قەڵەباڵغی بوو، لە بەردەم پرسگەکەدا نۆرە گیرابوو. ئێرانی و عەرەب نۆرەیان گرتبوو.

بۆ مایەی خۆشبەختیم، پێویست نەبوو زۆر لە نۆرەکەدا بووەستم تا پرسیارەکانی خۆم بکەم، چونکە دەرگەوانەکە منی بینی، بە پیرمەوە هات و یارمەتی دام.

بە ڕێزو خەندەیەکەوە لێی پرسیم: "چ خزمەتێکت هەیە؟"

منیش دەستبەجێ پێموابوو شتێکی ناڕاست لە ئارادایە.

ئاخر ئەو خەڵکی پاکستان بوو یان هیندستان، یان هەر وڵاتێکی دیکە، کە هی من نەبوو، باشە چۆن لەو جەنجاڵییەی پرسگەکەدا یەکسەر منی بینی و بۆ لام هات تا کارەکەم ڕایی بکا؟ واپێدەچوو هەندێک جێگەی گومان بێ. بەڵام لەوانەشە من سەرچێخ چووبم.

- "ئۆو، چاوەڕێی دایکم دەکەم، بە دوای کەسێکی سەر بە نووسینگەی گەشتی ئێران-دوبەیدا دەگەڕێم، بەڵکو زانیارییم بداتێ ئاخۆ کەی دەیگەیەننە هوتێلەکە، چونکە وابزانم ئێستا گەیشتوونەتە فڕۆکەخانەکە."
ئەویش چاوێکی بە نێو ڕیزبوارەکاندا گێڕا و بە قامک ئاماژەی بۆ کچێکی گەنج کرد.

- "لەوێیە، ئەوەی ئەوێ ڕێبەری نووسینگەی گەشتیارییەکەیە."
- "زۆر سوپاس." منیش وام پێگوت و بەرەو ڕووی خاتوونەکە چووم.

ئەویش ژنێکی گەنجی ناسک بوو، پرچێکی ڕەشی هەبوو بە قردێلەیەک بەستبوویەوە. نموونەی ژنێکی ئێرانی تەمەن سی ساڵانە بوو. لەگەڵ ڕێبوارێکی دیکەی ئێرانیدا قسەی دەکرد، کەمێک لە دوورەوە وەستام، تا لە قسەکانی دەبێتەوە. ژنەکە ڕوویێکی میهرەبان و بەخەندەی هەبوو.

لەنێو کتێب و فیلماندا، زۆر جاران ئەوە ڕوودەدا، کە پیاو و ژنێک تووشی یەک ببن و لەیەکەم نیگادا شت بقەومێ.

بەڵام خۆمن لەو ساتەدا، زۆر لەو شتە دوور بووم. ژنەکەم لە سەرەوە، لە نهۆمی شەست و پێنجەمین بوو، دایک و خوشکیشم لە ڕێگەدا بوون و بارێک یادەوەری کۆنینەشم کە بە سەلامەتی هەڵگیرابوون، بە جارێک لێم ژینەوە.

ئینجا ژنەکە ڕووی تێکردم و بە دەنگێکی دۆستانە گوتی "خۆشحاڵم بە بینینت. پێموابێ تۆ دەتەوێ شتەکان بپشکنی و لێیان دڵنیا ببیتەوە."

من گومانم بۆ ئەوە چوو، پێشتر وێنەیەکی منی بینی بێ، دەنا چۆن منی وەک مەعمیلێکی خۆی ناسییەوە؟ تۆ بڵێی لە گوگڵ سەیری کردبێ، ئاخۆ سەر و ڕووخساری مەعمیلە بیانیەکانی چۆنە؟

- منیش گوتم: "بەڵێ، بۆ سەروسۆراغ هاتووم."
- "ئایا بە سویتەکەت قایلی؟"
- "هەڵبەتە. لە دڵەوە سوپاس، لەوە باشتر نابێ."

- "شایانی نییە، بە خۆشحاڵییەوە،" ژنەکە وای پێگوتمەوە و ئینجا شتێکی وای کرد کە نەدەبوایە وا بکا. دەستێکی لە قردیلەی پرچەکەی داو، قژە ڕەشەکەی بەسەر شانەکانیدا پەخش بوو.

منیش بە خۆمم گوتەوە، خۆ من هاتوومەتە دوبەی تا بە دیداری دایکم شاد ببمەوە، دیدارێک کە دوا دیدار و چاوپێکەوتن دەبێ.

- "خانم، من...."

- ئەویش پێی گوتمەوە: "من ناوم « نەستەرەن »ە".[15]

نەستەرەن ناوێکی فارسییە، ناوەکە لە گوڵێکی ناسکەوە هاتووە بە فەرەنسی ئیگلانتینەی[16] پێدەڵێن. بەڵام با ئەوە بەلاوە بنێین.

- "ئەرێ کەی دایکم دەگات؟" وەهام لێپرسی.

ئەویش دەستی دایە مۆبایلەکەی، بەنێو بەرنامەی وەتس ئەپەکەیدا گەڕا و گوتی: "ئەوان دابەزیون و هەر ئێستا لە فڕۆکەخانە بەڕێکەوتوون."

- "ئاها، زۆرباشە، سوپاس." من وام پێگوت و ئاماژەیەکی وام کرد، کە دەمەوێ بڕۆم و یەخەی خۆم لە یەقەی ئەو کچە شۆخ و شەنگە بکەمەوە.

لە ڕاستیشدا دەمویست بزانم ئاخۆ پارەدانەکە هەموو لە جێی خۆیدا بووە، خۆ کەمێکی دیکە، بە خۆی و لیستی پارەدانی دیکە بەسەرمدا نادا، بەڵام نەمدەویست لە شانازییەکەم کەم بکەمەوە.

کاتێک بینی کە من لەگوتنی شتێک دوودڵم، پرسی: "ئەرێ پرسیاری دیکەت هەبوو؟"

---

[15] Nastaran

[16] Eglantine بە کوردیش گوڵە شیلانەیە. و.

- "نەخێر. هەر ئەوە بوو. سوپاست دەکەم. سوپاسی هەموو ئەو ماندووبوونەی ئێوە و نووسینگەی گەشتیاری دەکەم، کە بۆ دایکمتان کردووە."

- "شایانی نییە." ئەو وای پێگوتمەوە، لە کاتێکدا بە هەردوو دەستی پرچی لە پشتەوە بەستەوە.

ئینجا بۆ کەمێک چوومە دەرەوە و لەبەر گەرمایەکە وەستام، هەوای پیس لەسەر شۆستەکەوە دەهات، بێوچان لەوێ لە لای شۆستەکە تاکسی دەهاتن و خەڵک لێیان دادەبەزین، یان لێیان سوار دەبوون و دەڕۆیشتنەوە. لە پشت جامەکەشەوە سەیری ناو هوتێلەکەم کردەوە. « نەستەرەن»م بینی، بینیم چووەتە لای پیاوێک، کە لای دەرگەوانەکە وەستابوو، پیاوێکی گەنج کە هەر دەبێ ئێرانی بێ، بیچم و ڕەفتارەکەی بۆ من بووە مایەی نیگەرانی.

لەوانەشە ئەوە بەهۆی وروژاوی گەشتەکەوە بووبێ، یان بەهۆی ڕژێمی ئێرانییەوە بووبێ، کە لە هەموو شوێنێک چاویان هەبوون و سووسەی هەموو شتێکیان دەکرد.

کەمێک دواتر «نەستەرەن» دەستی دایە مۆبایلەکە و هاتەدەر و گوتی: "دایکت ئێستا دەگات."

چاوەکانم زوورانەوە و ئەویش فرمێسکەکانمی بینی.

بە نەرمییەکەوە گوتی: "پێشبینی ئەوە دەکەم."

## ٨

## دایکم

**کاتەکە** لەوە زیاتری خایاند، کە من چاوەڕێم دەکرد، دنیاش تاریک داهات.

لە دەرەوە و لە نێو تاریکییدا، لەبەردەم هوتێلەکە ڕاوەستابووم، یادەوەریشم گەڕایەوە ماڵەکەمان، لەو شارەی لێی لە دایک ببووم. ئەوەی ئێستا بیرم هاتەوە، بۆ من شتێکی نوێ بوو، مایەی حەپەسانیشم بوو. شتێکی سەیرە، ئاخر پێشتر ئەو بیرۆکانەم بۆ نەدەهاتن.

زوو، کاتی خۆی دایکم زۆر جاران حەکایەتی بۆ دەگێڕامەوە. بەڵام ئێستا، من لە چاوەڕوانی ئەودام؛ لەسەر شۆستەی هوتێلێک ڕاوەستاوم، بیریشم هەڵفڕی و بۆ سەردەمی گۆرینێ[17] گەڕایەوە، هەستمکرد، دایکم زۆر جاران لە پشت پەردەوە دادەنیشت، ئینجا حەزی لێبوو حەکایەتەکانی بگێڕێتەوە. زۆرجاران لە پشت پەردە دادەنیشت، لەو شوێنە تاریکەی کە ناوبڕێک لەنێوان کۆگاکە و ژووری نوستن، پەناگەیەکی تەلیسماوی بوو، کە کتێبە کۆنەکان، هەگبەکان، پاڵتۆ و پێڵاوەکانی باپیرە کۆچکردووەکانمانی تێدا هەڵگیرابوو. کەچی ئێستا، لەبەر تاریکی لەسەر شۆستەی بەردەمی هوتێلێکی کەشخەی سەر ڕێگەی شێخ زاییدا، خۆم دەبینییەوە. بە خەیاڵ دەگەڕامەوە دواوە، وەک ئەوەی منداڵێک بم، تەنیا لەسەر مافوور دانیشتبێ و گوێ لە دایکی بگرێ کە لەپشت پەردەوە دانیشتبوو، حەکایەتی بۆ دەگێڕانەوە. ئاخر کە چیرۆکەکان بەو جۆرە دەگێڕدرانەوە، ڕەهەندێکی زێدەباری دیکەیان وەردەگرت. من هەمیشە بە بێ ئۆقرەیی، چاوەڕێم

---

[17] سەردەمی گۆرینێ: سەردەمی کۆن.

دەکرد، تا تاریکان دادەهات و دایکیشم لە ئیشوکاری ڕۆژانەی خۆی دەبووەوە، ئینجا دەچووە پشت پەردەو لێی دادەنیشت. لەوانەیە ئەو کارە بۆ ئەو، تاکە شێوازێک بێ، خۆی لە ژیانێکی ماندوویی لەگەڵ پیاوێکی کەڕولاڵ و پێنج منداڵدا بدزێتەوە و خۆی بداتە دەست دنیای ئەندێشە و خەیاڵ، کە دەیتوانی بە ئارەزووی خۆی گەشتی خەیاڵی بکا و بۆ هەموو لایەک بڕوا و هەر بڕوا.

بە یەکەوە لەگەڵ دایکم و بۆ یەکەمجار – هەر بە خەیاڵی ئەو- گەشتێکمان بۆ «مەککە» کرد، لەوێ من وەک منداڵێک ئەو پەردە کۆنینە و گەورۆنەیەی کەعبەم تی دەدا[18]، تا چاوێک بە نێو ماڵی ئەللادا بگێڕم.

لەنێو ئەدەبیاتی کلاسیکی دابونەریتماندا، ئێمە ژنێکی دیکەمان هەبوو، دەچووە پشت پەردە و حەکایەتەکانی دەگێڕایەوە: شەهرەزاد، ئەو حەکایەتخوانە تەلیسماوییەی نێو حەکایەتی هەزار و یەک شەوە.

من هێشتا هەر بەو یادەوەرییانە خەریک بووم، کاتێ کۆستەرێک بە بەردەم هوتێلەکەمان، هوتێلی شێخ زاییدا تێپەڕی. وام زانی، ئەوە ئەو کۆستەرەیە کە من چاوەڕێی دەکەم. بەڵام کاتێ گەیشت، هەندێ دوورکەوتەوە، پاشان لەسەر ڕۆیشتنەکەی خۆی بەردەوام بوو، بە پێچی لای ڕاستدا بایدایەوە و بە هێڵی تەریبی هوتێلەکە بەرەو بەردەم هوتێلەکە ڕۆیشت.

منیش چاوم هەر لەسەر ڕێیەکە بوو، هەندێکی خایاند تا کۆستەرێکی دیکە لەسەر ڕێگە لاتەریبەکەدا پەیدابووەوە و ڕێکوڕەوان لەبەردەم دەروازەی هوتێلەکە ڕایگرت.

---

[18] تیدان: کەمێک پەردە لادان.

لەوانەی لێی هاتنەخوارەوە، ڕووخساری دایکم و چەند پیرەژنێکی دیکەم لە پشت جامە تاریکەکانەوە بینین. من نەمدەزانی چی بکەم، ئایا دەرگەی کۆستەرەکە بکەمەوە یان بوەستم تا «نەستەرەن» دێت و بەخێرهاتنی مەعمیلەکانی دەکا. بەڵێ «نەستەرەن»یش هاتەدەر، دوو پیاو یاوەری بوون، کە عەرەبانەیەکیان پێبوو. «نەستەرەن» دەرکەی کۆستەرەکەی کردەوە و پێی گوتن: "هەمووتان بۆ «دوبەی» بەخێربێن!"

بەم جۆرە یارمەتی نۆ ژن و پیاوی بە تەمەنی دا، تا لە مینی پاسەکە دابەزن و منیش بە ئارامییەوە وەستام تا دایکمم بینی. بەڵام یەکەمجار خوشکەکەم لە کۆستەرەکە دابەزی. هەر بەڕاستیش شتێکی سەیروسەمەرە بوو، ئاخر خۆ من لە تەمەنی شازدەساڵییەوە بەو شێوەیە بە زیندوویی نەمبینیبوو. بەڵی ئێمە لەسەر خەت ڕاستەوخۆ بە یەکەوە قسەمان کردبوو.

من یەک شەنقاو لێی چومە پێشەوە و باوەشم کردەوە، بەڵام هەستم کرد ئەو هێشتا هەر بە کەشوهەوای کۆماری ئیسلامی لێیدەخوڕی، نەدەبووایە هیچ پیاوێک ژنێک لەباوەش بگرێ، هەر لەوەش گەڕێ کە ژن باوەش بۆ پیاوێک بکاتەوە.

"سەلام کاکە، گوێبگرە،" خەمخۆریی لە قسەکەی لێدەباری.

- "ئەرێ خێرە، چیبووە؟"
- "دایکم حاڵی باش نییە. هێشتا لە تاران خەڵکی دەناسییەوە. بەڵام لێرە، لە فڕۆکەخانەی دوبەیدا لەپڕێکەوە بووە ژنێکی دیکە. هەرچەندە و بە سەدان جار پێم گوت و پێمگوتەوە کە ئێمە بەرەو دوبەی دەڕۆین، کەچی ئەو هەر وای دەزانی دەچینە ئەمستردام. بە هۆی ئاڵۆزبوونی نەخۆشی لەبیرچوونەوە، بەیەکجار خراپتر بووە. ڕێی تێدەچێ هەر نەشت ناسێتەوە."

نەستەرەنیش لە پاڵ ئێمە وەستابوو، گوێی لێگرتبووین.

منیش بەسەر خۆمدا زاڵ بووم و گوتم گوێ مەدێ، دۆخەکە باش دەبێ. نەستەرەنیش یارمەتی دایکمی دا و لە مینی پاسەکەی هێنایەدەر.

دایکە بەستەزمانەکەم بچکۆلانە بوو، لەڕولاواز، تەواو سەری سپی ببوو. شاڵێک و سەرپۆشیکی لەسەر بوو. من هەر لە شوێنی خۆمدا وەستام تا ئەو دەگات. ئاوڕێکی دایەوە، دیاربوو مێشکی ئەوەندە جەنجاڵ بوو، بۆیە ئەو قەرەباڵغییەی دەوروبەرەکەی خۆی نەدەبینی. ئینجا ڕووی خۆی لە خوشکەکەم کرد و پێیگوت: "ئەدی برایەکەت کوانێ؟"

منیش لە پشتی ئەو وەستابووم، لەبەرانبەر دیوارە شوشەبەندەکەی هوتێلەکە لەو ڕامابووم.

"لەوێیە، ئەو لەوێ چاوەڕێی تۆ دەکا." خوشکەکەم وای پێگوت و ئاماژەشی بۆ من کرد.

دایکیشم لە دەوروبەری خۆی ڕوانی، منی بینی، بێدەنگییەکە باڵی بەسەردا کێشاین، چونکە ئەو دەبوایە پاڵ بە هێزی ڕەشی لەبیرچوونەوە بنێ، تا شتەکان لەیەک بکاتەوە. خەندەیەکی ناسینەوەی کەوتە سەر ڕووخسارە دێرینەکەی، هەر دەستبەجێش سەرنجێکی دەربڕی: "بەڵێ، هەر لە باوکت دەچی."

من دەمویست باوەشی پێدا بکەم، بەڵام ئەو بواری نەدا. ئاخر خۆ ئەو منی وەک زارۆکێک پەروەردە نەکردبوو، بەڵکو وەک جێگرەوەیەک بۆ باوکە کەمئەندامەکەم.

منیش تەماشای ئەوم کرد، بە جوانی دیاربوو کە وردیلەتر و لاوازتر ببوو، بە جۆرێک ڕەشەبای بیابان دەیتوانی لەگەڵ خۆی هەڵیبگرێ و ببیا.

دایکم وەرسووڕایەوە و ئاوڕێکی لە تەلارە هەوربڕە بەرزەکەدا و گوتی: جاری پێشتر کە هاتمە ئەمستردام، هیچ تەلاری بەرزی وا لەو ناوە نەبوون. هەموو شتێک لێرە گۆڕاوە، باشە خەڵک کەی ئەو کاتەی هەبووە، ئەو بورجە بەرز بەرزانە ڕۆبنێن؟"

دەمودەست خوشکم قسەکەی بۆ ڕاست کردەوە: "دایکە، خۆ ئێمە لە ئەمستردام نین، ئێمە لە دوبەین، ئەدی پێشتر پێم نەگوتبووی."

دایکم، دایکە کەڕەپەکەم[19] من لە زوووە دەمناسی، پێی گونجاو نەبوو، کە خوشکم قسەکەی بۆ ڕاست بکاتەوە. بۆیە هیچ گوێی بە سەرنجەکەی ئەو نەدا.

منیش دوودڵ بووم لەوەی ئاخۆ، بەردەوام قسەکانی ئەو ڕاست بکەینەوە، یاخود لێی بگەڕێین هەروا بڕوا. شەیتان هاتە بن کلێشەم: "هەر بژی جیهانی خەیالاوی. لێیگەڕێ چۆن حەزی لێیە با وا بیربکاتەوە و تۆش ئەمە بخەرە سەر کاغەز."

دیسان دایکم سەرنجێکی دیکەی دەربڕی: "ئەرێ چیە ئێرە زۆر جەنجاڵە، پێشتر شەقامەکە ئەوەندە سیخناخ نەبوو."

- "دایە، ئێمە لە دوبەین!" خوشکەکەم دەردەست لێیهاتە دەنگ.
- "دەی لێیگەڕێ، پێویست ناکا بۆی ڕاست بکەیتەوە." من ئەمەم بە نەرمییەکەوە بە خوشکم گوت. خوشکەکەشم بە سرتەیەکەوە پێی گوتمەوە: "بەڵام دکتۆرەکە گوتی، دەبێ ئێمە بەردەوام بۆی ڕاست بکەینەوە، دەنا بەنێو حاڵەتی لەبیرچوونەوەدا زیاتر شۆڕ دەبێتەوە."

---

[19] کەڕەپ: نەسەلمێن، سەرڕەق، عیناد.

- ˚ هەنووکە نا، جارێ نا. هێز و گوڕی لەبیرچونەوەی ئێستا لە هەموو جاران زیاترە. ئێمە دەبێ بە شێوازی ئەو، ئەو گەشتەی پێبناسێنین.˚

- من هەستم کرد، خوشکەکەم لەگەڵ بۆچوونەکەمدا نەبوو، بەڵام خۆ ئەوێ ئەو شوێنە لەبارە نەبوو، زیاتر لەسەری بڕوا.

نەستەرەن هەندێ بە نەرمی کورسییەکەی بۆ لای دایکم پاڵنا، ئینجا ویستی یارمەتی بدا لە سەری دابنیشێ.

دایکیشم تەڕدەست هاتە وەڵام؛ ˚نەخێر، کیژە میهرەبانەکە، سوپاس، دەمەوێ بەپێی خۆم بڕۆم.˚

بزە گرتمی. ئینجا دایکم ڕێگەی دام پیلی بگرم. قسەیەکیشی چرپاندە گوێم : ˚ئەرێ دیسان ئەو کیژە کێیە؟˚

˚ئەوە سەر بە نووسینگەی گەشتیارییە. ناویشی نەستەرەنە.˚ منیش وام پێگوتەوە، بە دەم ئەم قسەیەوە، لە هوتێلەکە چووینە ژوور.

لەوێ چووینە نێو ئەسانسێرەکە و ئینجا بەرەو نهۆمی شەست و پێنجەمین سەرکەوتین، لەوێ ژنەکەم بە خۆی و چایەی تازە دێمکراو و کولیچەوە، چاوەڕێی دەکردین.

٩

# له سویتی هوتێله‌که و له هه‌مان کاتیشدا له ماڵه‌که‌ی خۆمان له ئه‌مستردام

**ده‌رکه‌ی** سویته‌که کرایه‌وه. ژنه‌که‌م پێشوازی له دایکم کرد، ئامێزی تێوه‌رێنا و ده‌ستی گرت و بردییه ژووره‌وه.

من نه‌مده‌توانی بگه‌ڕێمه‌وه نیشتمانه‌که‌م، به‌ڵام ژنه‌که‌م له‌و دواییانه‌دا یه‌ک دوو جاران گه‌ڕابووه‌وه، چونکه دایکی له جێگه‌دا که‌وتبوو، له‌سه‌ر لێواری قه‌بر بوو. ئه‌وکات و له‌وێ دایکم و خوشکه‌که‌شمی له تاران بینیبوون.

دایکم به‌نێو ژووری دانیشتنی سویته‌که‌دا گه‌ڕا و گوتی: "پێشتر له‌وێ له لای په‌نجه‌ره‌که قه‌نه‌فه‌یه‌کی لێبوو، هه‌میشه له‌وێ داده‌نیشتم، ته‌ماشای ده‌رێم ده‌کرد. ئه‌رێ ئێوه چیتان لێکردووه؟ بۆ گۆڕیوتانه؟"

"دایکه!" من گوێم لێبوو خوشکه‌که‌م بانگی کرد، به‌ڵام له‌وه زیاتر هیچی دیکه‌ی نه‌گوت.

ژنه‌که‌شم به چاوێکی پرسیاره‌وه سه‌یری کردم. منیش به سرته‌وه پێمگوت: "وه‌ڵامی مه‌ده‌وه، ئه‌و هه‌روا ده‌زانێ له «ئه‌مستردام»ین، به هۆی گه‌شته‌که‌وه سه‌ری لێتێکچووه. زۆر هیلاک و ماندووه."

ئینجا ڕووم کرده دایکم و پێمگوت: "ئه‌وه ماوه‌یه‌کی زۆری به‌سه‌رچووه، که تۆ و باوکه هاتنه سه‌ردانمان. ئه‌وکات هێشتا کیژه‌کان هه‌ر له‌گه‌ڵمان بوون،

ئێستا هەموو شتێک گۆڕاوە، دەی سەیری من بکە، منیش گۆڕاوم، بۆز بووم.˝

ئەویش هەر گوێی پێنەدام، زۆر بە ئەپارتمانەکە سەرقاڵ بوو، دەیویست زیاتر بیپشکنێ.

˝باشە ئەوە چ یاریەکە تۆ لەگەڵ ئەودا دەیکەی؟˝ ژنەکەشم بە هەراسانییەکەوە کەوتەوە قسەکردن؛ ˝ئەوە شتێکی باش نییە، تۆ دەیکەی. هەر ڕاست پێی بڵێ، کەوا ئێرە هوتێلە و ئێمەش لە هۆڵەنداوە بۆ دیداری ئەو هاتووین.˝

˝خۆ دایکم بە خۆی بینی کە ئێرە هوتێلە.˝ منیش وا وەڵامم دایەوە؛ ˝لە خوارێ بە دەیان میوانی هوتێلەکەی بینین لە هۆڵی چاوەڕوانییەکە وەستابوون. خوشکیشم سەد جاران بۆی دووپاتکردۆتەوە، کە ئێمە لە ئەمستردام نین، بەڵکو لە «دوبەی»ن. دەی لێیگەڕێ، چۆن بیر دەکاتەوە با وابێ. خۆ من ناچم هەموو قسەیەکی بۆ ڕاست بکەمەوە.˝

– ˝بەڵام بەم جۆرە تۆ لەگەڵ یاریەکەی ئەودا دەڕۆی.˝

– ˝چۆن ئەوە دەڵێی˝ منیش بە سەرسوڕمانەوە وام پێگوت، بەڵام دەشمزانی هەندێک جاران ئەو باشتر لە خۆم، خۆم من دەناسێ.

منیش دەستەوەستان بووم، نەمدەتوانی سنوورەکانی نێوان ئاکار، واقیع و خەیاڵ لە یەک جیابکەمەوە. هەندێک جار و ناوبەناو دەربارەی لەبیرچوونەوە و وڕێنەکردنم بیستبوو و خوێندبووشمەوە، جارێکیان فیلمێکیشم بینیبوو. بەڵام وەک هەراشێک[20]، هەرگیز کەسێکم لە نزیکەوە نەبینیبوو، توشی داوی نەخۆشی لەبیرچوونەوە بووبێ. خۆ نەشمدەویست

[20] کەسێکی هەراش: کەسێکی گەورە و بالق.

پێبەپێی ئەو بەزمە بڕۆم، بەڵام خۆ من پەرۆشی کەسێک بووم، لەو بارەدا دایکم بوو، کە گیرۆدەی دەستی لەبیرچوونەوە ببوو. ئەوەش دەرفەتێکی بێوێنە بوو، لەگەڵیدا بڕۆم. بۆیە منیش دەمویست وەک خۆی لەگەڵیدا بم، لەوانەشە یاریەکەشی لەگەڵدا بکەم، تا زیاتر لەو کەسە نزیک ببمەوە، لەو ساتانەی کە لە جەستەکەی خۆی دەردەچێ، ئەو دایکەی تۆ دەتناسی لەبەرچاوت نامێنێ و مەرگیش هەر دەلورێنێ.

دایکم بەرەو ناندینەکە ڕۆیشت.

- ˝دایە، دەڵێی برسیتە؟˝ ژنەکەم وای لێپرسی. ˝کەمێکی دیکە نان دەخۆین. لە «دوبەی»ش هەروەک ئێران خەڵک درەنگ، نانی شێوان دەخۆن.˝

- ˝نەخێر، سوپاس. ئازیزەکەم، من هێشتا برسیم نەبووە.˝ دایکم وای پێگوتەوە و لە ناندینەکە هاتەدەر.

لە ژووری دانیشتنەکە، لەلای مێزی کۆمپیوتەرەکە ڕاوەستا. لەوێ بۆ ئەو زڕەمافوورە کە لە بن مێزەکە داندرا بوو، چەمایەوە، هەر تەماشای دەکرد. لەڕاستیدا خۆ هەموو ئێرانییەک هەروا دەکا: هەر کاتێ مافوورێک دەبینن، بۆی دەچەمێنەوە، دەستی لێدەدەن و دەیپشکنن، ئاخۆ پێکهاتەکەی ماک و ڕەسەنە.

- ˝ئەمە زڕە، ئەمە مافووری کارخانەیە، دەستکرد نییە.˝ دایکم وای هاوارکرد. ˝باشە ئەو مافوورە لەکوێیە کە باوکت جارەکەی دیکە بۆی هێنابووی؟˝

منیش هیچ وەڵامم نەدایەوە، وەستام تا ژنەکەم وەڵامێکی ئەو پرسیارە گرنگە دەداتەوە، بەڵام خۆ ئەویش خۆی کێشایەوە ژووری نووستن و بە نەرمییەکەوە گوتی: ˝من لەگەڵ ئەو گەمەیەدا ناڕۆم.˝

هەر لەبیرم مابوو، چۆن دایک و باوکم، بۆ یەکەمجار بۆ سەردانی هاتنە لامان، ئەوەش پازدە ساڵ لەمەوبەر بوو. بە دەورەدراوی لەگەڵ زۆر کەسی دیکەدا، لە هۆڵی چاوەڕوانی فڕۆکەخانەی «سخیپول»دا وەستابووین. لەپڕێکەوە باوکم لە هۆڵەکە بە خۆی و مافوورێکی گوڵناری ئێرانی بەدەرکەوت، لوولی دابوو، لەبن باڵی هەڵگرتبوو. شەپقەیەکیشی لەسەر بوو، سمێڵەکانیشی تەواو ماشوبرنجی ببوون. کاتێک لەنێو حەشاماتەکەدا بینیمی، ئاماژەی بۆ دایکم کرد، کەوا من لەوێ وەستاوم. ئاماژەی بە مافوورەکەش دا، کە لە بن پیلی هەڵیگرتبوو، ئینجا بە زمانی ئاماژەوە گوتی: "بۆ تۆم هێناوە. بەتایبەت بۆ تۆ، تا لەسەری دابنیشی و بنووسی."

لە جیهانەکەی ئەودا، خەڵک لەسەر مافووردا دادەنیشتن و مێزێکی بچکۆلانەشیان بۆ نووسین دادەنا، هەر بۆیەشە ئەو مافوورێکی گوڵناری ڕەنگینی لەگەڵ خۆیدا بۆ هێنابووم.

کاتێکیش گەیشتینەوە ماڵ، دایکم مافوورەکەی لەبن کورسی و مێزەکەدا دانا و گوتی: "دەی کوڕم، دانیشە. ئێستا پێت لەسەر ئەو مافوورە گەرم دەبنەوە."

ئەو یادگارە خۆشەویستەی ئەوان هێشتاش و هەمیشە هەر لە بن کورسی و مێزی نووسینگەکەمە، لە ژووری کارم لە ئەمستردام. هەنووکەش دایکم دەیویست بزانێ ئاخۆ ماوە و لە کوێیە. منیش دوودڵ بووم. دەبوایە شتێک بڵێم: "دایکە، ئێمە ئێستا لە «دوبەی»ین. مافوورەکە هەر لەبن مێز و کورسی ژووری کارکردنمە لە ئەمستردام. بەڵام ئێستا ئێمە لە ژوورێکی هوتێل داین، ئەو مێز و کۆمپیوتەرەش هی من نین."

بەڵام خۆ ئەو، ئەو دەرفەتەی پێنەدام تا ئەمەی پێبڵێم، چونکە باسکی گرتم و چرپاندییە گوێم: "من دەزانم ئەو، مافورەکەی پێ جوان نەبوو، هەر دەبێ ئەو فڕێی دابێ."

مەبەستیشی لە "ئەو" ژنەکەم بوو. دایکم پێیوابوو، ژنەکەم هیچ کەیفی بە مافوورەکە نەهاتووە، هەر بۆیە فڕێیداوە.

"نەخێر، دایکە، ئەمە ڕاست نییە. ئەو مافوورەکەی ئێوەی زۆر پێ جوان بوو."

دایکم بێدەنگ ما، منیش لە چاوەکانیدا خەمێکی قووڵم بەدی کرد.

دایکم بە ئاسانی هاوسەنگی خۆی لە نێوان دنیای خەیاڵ ڕاستیدا ڕادەگرت. ئەو ڕەنگی ئەو مافوورەی دەزانی کە باوکم بۆی هێنابووم، بەڵام سەرنجی ئەوەی نەدەدا، کە ئێمە لە هوتێلێکی گەورە و لە نهۆمی شەست و پێنجەمین داین. دیسان ئەهریمەن چرپاندیەوە گوێم: "دەی لەگەڵی بڕۆ، بزانە بە کوێ دەگەی."

یارمەتی دایکم دا گەیاندمە ژووری نوستن، کە بۆ ئەو بەڕادان درابوو.

– " دایکە، بەر لەوەی نان بخۆین وا باشترە، بۆ سەعاتێک چاوەکانت گەرم بکەی."

–

ئیدی ئەویش هەر بە جلەکانیەوە چووە سەر پێخەفەکەی و لێ درێژ بوو، چاوەکانیشی نوقاندن.

منیش باش دەمبینی، چۆن مافووره گوڵنارییە ڕەنگینەکە، گەڕاوەتە نێو یادەوەرییەکانی.

١٠

# چاویلکەی تاریک

لەو کاتەی دایکم سەرخەویکی دەشکاند، ژن و خوشکەکەشم سەرگەرمی بازاڕی قسەی خۆیان بوون، من هاتمە دەرێ. باری ورووژاوییەکەم کەمێ سووک ببوو، بیریشم لەوە کردەوە، ئاخۆ ئێمە لەو ماوە دیدارییەدا چی بکەین.

هێشتا هەستێکی زۆر بەهێزم هەبوو، دایکم بە تەواوی چۆتە نێو جیهانەکەی خۆی و گەڕانەوەی بۆ نییە، منیش ناتوانم لەو جیهانەیدا دەریبهێنم. وێڕای ئەوەش، حەزم لێبوو خوشکەکەم چێژ لەو سەفەرە وەربگرێ، چونکە بۆ ئەو، یەکەمین سەفەری بوو بۆ دەرەوەی وڵات. ئاخر ئەو ساڵانێکی دوورودرێژ بوو سەفەری لێ قەدەغەکرابوو، ئێستاش لە یەکێ لە ژوورەکانی هوتێلێک لە «دوبەی» دانیشتووە.

من لەسەر شۆستەی ڕێگە جەنجاڵە خێراکەی بەردەم هوتێلەکە پیاسەم دەکرد و بە خۆیشم دەگوتەوە: دەی کارێکی وا بکە ئەو سەفەرەیان لێ خۆش بێ. بەڵام چۆن دەتوانی شتێکی خۆش لە شوێنێکی دەستکرد و ساختەدا بە ئەنجام بگەیەنی، کە لە هەموو لایەکەوە هەر وێنە و پۆستەری «جۆرج کلوونی» ئەکتەرە، وەک زەبەلاحێک وایە و کوپێکی لە قاوەی «نێپرۆسۆ»ی بە دەستەوەیە؟ ئێرە، «دوبەی» شوێنێکە هەروەک ڕۆژگاری فیرعەونەکانی میسر وایە، کرێکارەکان لەبەر ئەو خۆرەتاوە گەرمەدا، هەر خەریکی دروستکردنی تاوەری بەرز بەرزن.

«دوبەی»، ئەو شوێنەیە، ئەو خەڵکەی سەر بە هۆز و تیرەکانی خۆی نەبێ، هیچ مافی هاووڵاتیبوونیان نییە.

ئاخر خۆ هیچ پرسی کلتووری تایبەت بە «دوبەی» لە ئارادا نییە، نە زمانی دوبەی، نە ئەدەبیات و نە دابونەریت و بۆنەی خواردنی دوبەی و نە هیچ، هیچی وای نییە... من بم، هەرگیز لێرە نابم و ناژیم. ئێرە شوێنێکە تایبەت بە دەلاڵ، بە وەستای پیزا، بە بازرگانە چینییەکان کە بە ملیۆنان لە بەرهەمە هەرزانەکانیان بە بازرگانەکانی دیکەی جیهان دەفرۆشن. بەڵێ ئێرە وڵاتی خەونی ملیاردلێرە بەریتانی و ئەمریکییەکانە، کە یەک فلس، باجیش نادەن.

بەڵام خۆ ئێستا کاتی ئەو لێدوانانە نەبوو. من زیاتر قەدەمم لێدا، هەر بیرم لێدەکردەوە، ئاخۆ چۆن لەبن ئەو بارودۆخەدا، ناوەڕۆکێک بە گەشتەکەمان بدەین، خۆ نابێ بە ڕۆژ و شەو، ئەو ماوەی دیدارەمان هەر لەنێو چوار دیواری سویتی هوتێلەکەدا بەسەر بەرین.

لەپڕێکەوە، زانیم چی بکەم.

من دەبێ، ئەو چاویلکە تاریکەی «چی گیڤارا» لە چاوم بکەمەوە. من دەبێ بۆ ماوەی هەفتەیەک، سەرمایەداری، سۆشیالیزم، ماویزم و هەموو ئیزمەکانی دیکە بئاخنمە نێو گەنجینە گەورەکەی هوتێلەکە، کە بە ژمارە دادەخرێ و دەشکرێتەوە. من دەبێ خۆم لەو هەموو بیردۆزانە ئازاد بکەم، تەنیا بە چاوی دایکم تەماشای «دوبەی» بکەم. من نابێ هیچم بە دڵ بێ یان بە دڵ نەبێ، من تەنیا دەبێ سەیری خەڵک و کردەوەکانیان لە «دوبەی» بکەم.

ئەمە خۆی چارەسەرەکە بوو، دۆزیمەوە.

بەم هزرەوە باری سەر شانم لاکەوت. چاویلکە تاریکەکەم لاچوو.

به پەیژەکان سەرکەوتمە سەروو، لە ماکدۆنالدەکە سەیری ئەو ناوەم کرد. ئینجا هەموو شتێکم بە جیاوازی بینی. ئاخر خەڵکەکە ئەو چۆڵ و بیابانەی کە مایەی لێژیان نەبوو، گۆڕیویەتی و کردوویەتیە وڵاتی خەیاڵ، کردویەتیە شوێنی کریسمس و دیزنیلاند. دوبەی خەیاڵ بوو، ڕۆمانێک بوو، دایکم شاکەسەکەی بوو. کەواتە منیش دەبوایە گەشتەکەم وەک شتێکی خەیاڵکردە بزانم و بە دوایدا بڕۆم.

ئەمەش وایلێکردم بە توندی دەستی پێوە بگرم.

من هەر بە پیاسە گەڕامەوە هوتێلەکە، دەستم بۆ «نەستەرەن» هەڵبری، کە لەگەڵ سەرنشینێکی دیکەی هوتێلەکە، لە هۆڵی چاوەڕوانیدا وەستابوو. ئەویش بزەیەکی بۆ کردم، خەریکبوو لەبەرانبەریدا لاواز دەرکەوم، وەک ئەوەی من تاکە پیاوی سەر ئەم گۆی زەوییە بم.

خۆم خستە نێو ئەسانسێرەکە و بە چاوتروکانێک گەیشتمە نهۆمی شەست و پێنجەمین. کارتەکەم لە شوێنی دەستنیشانی دەرکەکە ڕا کرد، دەرکەکە کرایەوە و بانگم کرد: "ئەرێ هێشتا دایکە هەر نوستووە؟"

نەخێر، ئەو نەنوستبوو، ئەو لەنێو ژووری دانیشتن وەستابوو، چاوەڕێی دەکردم و لەپڕ دەرکەوت و هەندێکی بە قسەکەی سڵەمیمەوە و گوتی: "کوڕم، ئای چ ژوورە هوتێلێکی کەشخەیە، کە بۆ ئێمەت گرتووە."

ئۆخەی، خۆ دایکم گەڕاوەتەوە دۆخی ئاسایی خۆی، هەر هیچ نەبێ بۆ ئەوێ دەمێ کە قسەی دەکرد. ئەو پشووە و سەرخەوشکاندنە، کاری خۆی کرد، باری وروژاویەکەی سووک کردبوو، گەڕابووە سەر بارە ڕاستەقینەکەی خۆی.

دایم گوتی: "برسیمە."

"دەی با نانەکەمان بخۆین." منیش وام گوت و وام دانابوو کە بۆ ماوەیەک دایکم لە دەست دابوو.

شادمانی وەک خونچەگوڵێک لەنێو دڵمدا کرایەوە.

## ١١

# نۆڤلێتەکە

**ناندینێکی** بەرفرەوان لە سویتەکەمان هەبوو، بەڵام خۆ ئێمە ئەو کاتەمان نەبوو، تا بە خواردن ئامادەکردن خەریک بین. ئێمە هەر بۆ خۆشیش، دەمانویست خواردنە خۆجێییەکان تام بکەین، بەڵام خۆ شتێکی تایبەتمەندی خۆیان لە «دوبەی» دەست نەدەکەوت. هەموو خواردنەکان، هەر هی ئەو کۆچبەرانە بوون، کە بۆ کارکردن هاتبوونە بیابانەکەی دوبەی، لەگەڵ خۆیان هێنابوو.

ئێمە بەسەر شۆستەیەکی بەرین، بە بەردەم ڕیزە دووکانێکی چراخاندا ڕۆیشتین، لەوێ لەو گوڕدەمی خەڵکەدا، نە سەری دیاربوو نە بن. لە بانەوەش، لە بەرزایی ئاسمانی سەر دووکانەکان، بە تەریبی لەگەڵ ڕێگە خێراییەکەدا، مەیدان مەیدانی تەڕاتێنی میترۆ بوو. من ئاوا سێ مەتر لە دوای دایکم دەڕۆیشتم، ئەویش لە بەینی ژن و خوشکەکەم دەڕۆیشت.

بۆ من ئەو گەشتە و لەگەڵ هەرسێکیان وەک گەشتی جنۆکان وابوو. وام دەزانی «دوبەی» وڵاتێکی خەیاڵکردە، پاشان دایکیشم لەنێوان دۆخی بیرچوونەوەی خۆی، لەنێو دنیای خەیاڵ و ڕاستیدا بە مەلە دەهات و دەچوو. لەنێوان ئەو دوو جیهانەدا، لە مێشکی مندا نۆڤلێتێک سەبارەت بەو گەشتە، چەکەرەی کرد. لەو گەشتەشماندا بیچمێکی تەلیسماوی هەبوو، ئەویش خوشکم بوو، بەڵام خۆ نەدەکرا ئەویشی تێبئاخنم. هەستم کرد ئەویش لە دنیای تایبەتی خۆی بە داڵغە و خەیاڵی خۆی سەرقاڵە، جیهانێک، دیاربوو من هیچم لێهەڵنەدەکراند.

بە تەنیا ژنەکەم بوو، کە بە هەردوو پێیەکانی لەسەر زەمینی جیهانی ڕاستی چەقاندبوون. ئەو کیژی بانکەوانێک (کارمەندێکی بانک) بوو، لێ ئەویش حەزی لێبوو بچێتە نێو دووکانێکی شیکی «چانێل» و چاوبگێڕی بەڵکو جانتایەکی ژنانەی نوێ بۆ خۆی بکڕێ.

من چاودێری خوشکەکەم دەکرد. ڕەفتارەکەی ئاساییانە نەبوو، هەروەک ئەوە وابوو، لەسەر هەسارەیەکی دیکەی وەک مەریخ یان موشتەری نیشتبێتەوە. ئەو تەماشای شتەکانی نەدەکرد؛ بەڵکو دەیپشکنین، خۆی چووبووە نێویان. ئەو بە سەرنجەوە سەیری ئەو قیتارانەی دەکرد کە بەسەر سەرمان دەهاتن و دەچوون. لەگەڵیان ئاوێزان بوو، هەندێ جار بۆ چەند هەنگاوێک تا وێستگەی ئایندە ڕای دەکرد، بەڵام پاشان چی؟ - هەر سەیرکردن.

ئەو بۆ هەر شتێک و هەر کەس وێنەیەکی بە تەلەفۆنە سەمسۆنگە کۆنەکەی خۆی دەگرت. لەبەردەم نەمام و گوڵوگیای لاپاڵ ڕێگەی «شێخ زاید»دا دەچەمایەوە و دەستی لە پەلکەکانی دەدا و لێیەوە ڕادەما. لەپڕیش ون دەبوو، لەپاڵ تەلارە هەوربڕەکان و لە پشت جامەکەوە تەماشای ترومبێلە ڕاگیراوەکانی گەراجەکەی دەکرد. وێنەیەکی «جۆرج کلونی»و دەزگای قاوەسازکردنی «نیسپرۆسۆ» نوێیەکەی دەگرت و تەنانەت بێ گوێدانە وەڕەزبوونی ژنەکەم، سەیری تەنەکەی زبڵیشی دەکرد.

لەهیکەوە خۆی بە وێستگەیەکی میترۆدا کرد، بینیم بەسەر پەیژەکاندا ڕۆیشت. دەترسام نەبادا بزری بکەم، منیش بەدوایدا غارم دا. بەسەر پەیژە کارەبایەکاندا سەرکەوتم و لەکاتی خۆیدا و لەسەر شۆستەی هاتنی قیتارەکان گەیشتمێ و لفکەی کراسەکەم گرت. ئەو جڵەوی خۆی لەدەستدابوو، بەڵام من بە حەوسەڵەوە بە هێواشی پێمگوت: "بەیانی ئەگەر حەز بکەی سواری میترۆ دەبین، بەس جارێ با بچین نانەکەمان بخۆین."

ئەو ڕەفتارەی خوشکم، وەهای لێکردم بیر لە نۆڤلێتێک بکەمەوە، کە زۆر دەمێک بوو خوێندبوومەوە. کورتە ڕۆمانەکەش دەربارەی مامۆستایەکی پیری ڕیش چەرمۆی سەردەمی یەکێتی سۆڤیەت بوو. ئەو بانگهێشتکرابوو، تا لەبەرلینی ڕۆژئاوای پێشوودا، کۆڕێک بگێڕێ. لە بەرلینی ڕۆژهەڵاتی کۆمۆنیستیەوە بە قیتار گەیشتبووە بەرلینی ڕۆژئاوا.

مامۆستای تایین، کە هەموو ژیانی خۆی لە بن دەسەڵاتی دیکتاتۆریی، ژینگەیەکی کۆمۆنیستییانە بەسەر بردبوو، لە ئازادییەکەی بەرلینی سەرمایەدارییدا هاوسەنگی خۆی لەدەست دا. خۆی دەبوایە تاکسییەکی بگرتبایە، تا بیگەیەندبایە شوێنی کۆڕەکە و وتارەکەی خۆی پێشکەش بکردبا، بەڵام ئەو هەر دێوانەئاسا بە نێو شەقامەکانی بەرلیندا پیاسەی دەکرد و ئازادییەکەی تام دەکرد. ئەویش هەروەک خوشکەکەم، سەیری تەنەکەی زبڵەکانیشی دەکرد، لەپشت جامەکان ڕادەوەستا، دەچووە نێو ئەسانسێرەکان، بۆنی دارودرەخت و گوڵەکانی دەکرد، دەستی لە تروومبێلەکان دەدا و بە دەمی بەش و بە چاوی زەق و حەیرانەوە تەماشای خەڵکی دەکرد.

ئیدی بەیەکجار هەموو فشاری دەوڵەتە کۆمۆنیستییەکەی لەسەر لاچوو، هەربۆیە نەیدەتوانی بە شێوەیەکی ئاسایی ڕەفتار بنوێنێ. ئاخر ئەو ئازاد ببوو، دەمودەست فڕێدرابووە نێو قولاییەکەیەوە، بۆیە بە هەموو لایەکدا هەر باڵەفڕێی بوو.

بۆ گەڕان بە دوای چێشتخانەیەک، زیاتر بە بەردەم ڕیزە دووکانە چراخانەکدا ڕۆیشتین.

خوشکم بە خۆی و سەرپۆشێک گەیشتبووە دوبەی، ئاخر لەبەر ڕژێمەکە، دەبوایە هەر وابکا. خۆی نەدەبوایە تەنانەت لەنێو فڕۆکەشدا لەسەری بکاتەوە، لەنێو هوتێلەکەشدا هەر داینەنا، بەڵام هەنووکە هەر بە خێشکەیی[21] و بە جووڵەیەکی بێ هەستوخوست، لە سەری لادا. بایە گەرمەکەی بیابانیش دەرفەتی خۆی بینی و یاری بە پرچە ڕەشەکەی کرد.

ئەرێ بۆچی منیش پێشتر بە چاوی خوشکەکەم سەیری ئەو شارە خەیاڵکردەیەم نەکرد؟ خۆ لێرەدا سەدان ژن و پیاوی ئێرانی بە ئازادی دەسووڕێنەوە، لێرەوە بۆ ساتێکیش بێ، ئەوان دوورن لەو جیهانە بەرتەسککراوەی کە مەلایەکان تایبەت بۆ ئەوانیان داهێناوە.

لەم شەوە ڕەنگینەدا، منیش لەگەڵ خوشکەکەم سەیری ئەو قیتارانەم کرد کە لە بانەوە، بەسەر سەرمانەوە لە جرتوفرتی خۆیاندا بوون. پەککوو، لەو جوانییە، ئەرێ هەر بەڕاست، ئەوانە بۆ کوێ دەڕۆن و لە کوێوەش هاتوون؟

من سەیری ئەو دەیان کیلۆمەترە گیاوگوڵی ئەو چیمەنەم کرد، کە بە قەدپاڵ ڕێگەکەوە بوو، گوڵیشی لێڕوابوو. خۆ ئێمە لە هۆڵەندا نین، کە لە هەموو لایەکەوە هەر سەوزایی و گوڵ و گوڵووک بێ، کە هەر لە خۆیانەوە چەکەرە دەکەن و خونچە دەردەکەن. ئێمە ئێستا لە بیابانین، کە ملیۆنان ساڵە هیچ گوڵە مێلاقەیە(تولیپێک)کی لێنەڕواوە.

من دەبێ لەبارەی هەموو ئەوانەوە بنووسم، بەڵام تێبینیم کرد، چیرۆکەکەی ئەم کتێبەم بە جیاوازی دۆخی ڕاستەقینەی خۆی، خەریکە ڕێچکەی تایبەتی خۆی وەربگرێ. پەرۆشیش بووم ئاخۆ چی بەسەردێ و دەگاتە کوێ،

---

[21] بە خێشکەیی: بە هێواشی، بە هێورەیی، بەڵام بە نیازی پێشوەختەوە.

چونکە لەکاتی نووسیندا، سەرنجمدا، کە لەڕاستیدا من خەریکی ڕێوڕەسمی ماڵئاوایی کردنم لە دایکم. لەوەش تێگەیشتم، ئەو پێواژۆیە تەنها لەنێو وشەکاندا جێگەی خۆی کردۆتەوە، لە نێو ئەو کورتە ڕۆمانەی خواحافیزییدا، کە من تازە و لەپڕ دەستم پێکردووە.

لە دوورەوە ترووکەکردنی تابلۆیەکی نیۆنی ڕەنگین، سەرنجی منی بۆ لای خۆ ڕاکێشا. بۆن و بەرامەی تیژی ڕۆژهەڵاتییانە منی گەڕاندەوە سەر دۆخی ئەنگۆرە ڕاستەقینەکە، خۆ ئەوە چێشتخانەیەکی لوبنانی بوو.

## ١٢

# لە چێشتخانەکەدا

**دایکم** کاتی خۆی، کە خێزانی خۆی بە دەورەوە بوو، باشترین ژەمە خۆراکی ئێرانییانەی ساز دەکرد.

"ئێستاش هیچی پێ ئامادە ناکرێ." خوشکەکەم ئەم قسەیەی بە نەرمی چرپاندە گوێم؛ "ئەو ئێستا نازانێ کەرەستەی شیولێنان لەیەک جیا بکاتەوە، پێشتریش بە هەزاران جار چێشتی لێناوە و ئامادەی کردووە. ئەو ئێستا خۆی لە ناندینەکە بە دوور دەگرێ، لە ئاگر دەترسێ، خۆ ئەگەر بۆ خۆشوشتنیش بچێتە گەرماو، دەترسم خۆی بە ئاوە گەرمەکە بسووتێنێ."

لە ڕاستیدا چێشتخانە لوبنانیەکە، خواردنگەیەکی میللی بوو، هەر بۆیەشە وا پڕ بوو. لەبەرئەوەی چەندین خێزان بە منداڵەکانیانەوە لەسەر مێزی خواردنەکە دادەنیشتن، کەشێکی خۆشی دەسازاند. لە هەموو لایەکیشەوە لەسەر قاپ و دەفری بچکۆلە بچکۆلەدا خواردنە بەتام و بۆنەکەیان پێشکەش دەکرد.

ئێمەش شوێنی خۆمان لەسەر مێزێکی چوار کورسییدا گرت و کورسییێکی زیادەشمان بۆ دایکمان هێنا. من لە تەنیشتی دانیشتم، خوشکم لە بەرانبەرم و ژنیشم لە تەنیشتی ئەو. کورسییە بە تاڵەکەش لە تەنیشت دایکم داندرا.

"من لێرە غەریبی باوکت دەکەم." دایکم ئەو سەرنجەی دەربڕی و چاویشی پڕ لە فرمێسک بوون.

هەر ئەم قسەیە خۆی لەخۆیدا، واتای ئەوەی دەگەیاند، ئەو لە بارێکی ڕاستەقینە لەگەڵمان لەسەر خوانی چێشتخانەیەکی لوبنانی دایە.

کاتێکیش، بە ماوەیەکی کورت، دوای ئەوەی سەردانیان کردم و گەڕانەوە، باوکم کۆچی دوایی کرد، لەگەڵیدا زمانی ئاماژەکانیش مرد. هەڵبەتە ئێمە لەنێو ماڵدا بە فارسی قسەمان دەکرد، بەڵام هەر کاتێ باوکم دەهاتەوە، بامان دەدایەوە سەر زمانی ئاماژە. ئەوەش زمانێک بوو، کە هەر خۆمان پەرەمان پێدابوو، جۆرە زمانێکی خێزان بوو.

من کاتی خۆی پەیم پێنەبردبوو، بەڵام دواتر کە هاتمە هۆڵەندا و لەوێ ژیام، ئەوەم بۆ دەرکەوت، هێشتاش ئەو زمانە ئاماژەیەی باوکم بەکاردەهێنم. ئەوەش مایەی سەرسامیم بوو، ئاخر هەرچەند تەمەنم هەڵدەکشا، زیاتر دەگەڕامەوە سەر خووی کۆن، سەر زمانی ئاماژە.

ئێستاش لە دەستەکانی خوشکم، کە لەسەر مێزەکە لەبەرانبەرم دانیشتووە، زمانی ئاماژەکە دەبینمەوە.

*ئەرێ ئەوێ چۆن بوو*، بە دەستەکانم کە لەسەر مێزەکە دامنابوون، بە ئاماژەوە وام بە خوشکەکەم گوت.

بەڵام خوشکەکەم وای خۆ نواند کە ئاماژەی دەستەکانمی هەر نەبینی بێ.

*دەی، دەربارەی ئەو ساڵانەم بۆ باس بکە*، من بە دەستەکانم زیاتری لەسەر ڕۆیشتم، بەڵام خۆ ئەو ئاگای لە من نەبوو، ئەو لەگەڵ ژنەکەم خەریکی قسە بوو. هەر بۆیە منیش زیاتری لەسەر نەڕۆیشتم.

لە دەرەوەش ویستم لێی بپرسم، ئاخۆ ئەو هەموو ساڵانەی چۆن لە زیندان بەسەربرد، بەڵام ئەوەش نەکرا. ئەو بەردەوام بۆشایی گفتوگۆی بەوە پڕ دەکردەوە، باسوخواسی کەسوکارمان بۆ باس بکا، ئاخۆ کێ لە خزمان، لە دۆستان و لە دەرودراسێماندا مردبوو.

خۆ ئەوەش پرسێکی ڕەوا بوو، کە بە ئامادەیی ژن و دایکم بیخەمە ڕوو، بەڵام ئەرێ بۆچی وام لێ نەپرسی؟ لەوانەیە ویستبم برینەکانی نەکولێنمەوە، ژانوسوێی ئەو ساڵانەی بە بیر نەهێنمەوە؟ لەوانەشە نەمویستبێ باسی «جەواد» بکەم، کە ئێستا بیست و پێنج ساڵی ڕەبەقە، بە نهێنی لەبن دار بادەمەکانی لای شاخەکان نێژراوە؟ تۆ بڵێی هەندێک جار، ویستبێتم، نە خوشکەکەم و نە خۆم هیچ ئازار بدەم، بەوەی کەوا ئێمە دەرچووین و «جەواد»یش بەرکەوت؟

ئەرێ بۆچی بە خوشکەکەم نەگوت، کە لەو ساڵانەی ڕابردوودا، هەر خەونم بە جەوادوە دەبینی؟ باشە بۆچی پێم نەگوت، لە مێشکی خۆمدا بە دەیان جار چوومەتە سەر گۆڕەکەی جەواد، کە لەوێ لەبن دار بادەمان لێدراوە، بەتایبەتیش لە بەهاران، ئەو کاتانەی خونچە گوڵە بادەمە سپی و قورمزی و نەرمەکان دەپشکوتن و دەکەوتنە سەر گۆڕەکە و دایدەپۆشت؟

لە «دوبەی»دا، ئێمە لە واقیع دوور کەوتبووینەوە، هەر بۆیەشە پێویست نەبوو بگەڕێینەوە سەر ئەو ساڵە پڕ لە کوێرەوەرییانە.

دیاربوو ئەوەش خەسڵەتی مرۆی نیشان دەدا. ئەو دەرکەی لەسەر خۆی دادەخا و لێیدادەنیشێ. ئینجا دەبێ منداڵ و نەوەکان بەشێوازی خۆیان چیرۆکەکە بگێڕنەوە و باسی بکەن و لەسەری بڕۆن.

خوشەکەشم نەیدەویست بە ڕوون و ئاشکرایی باسی خۆی بکا، بەڵام ئەو کتێبەی خەریکی نووسینی بووم، باشترین دەرفەتی بۆ ئەوە دەسازاند، کە لەتماغەی برینەکان هەڵدەمەوە و بە بێدەنگی باسوخواسەکەی بهێنمەوە گۆڕێ.

"ئەرێ ئەوە لەکوێی؟" ژنەکەم بە نەرمییەکەوە کەوچکێکی لەدەستم دا. بەم جۆرە منی هێنایەوە سەر جیهانە واقیعیەکە و سەر خۆشیی بەیەکەوەبوونی نێو چێشتخانەکە.

دواجار کە خوشکم بینیبوو، پرچەکەی کردبووە دوو کەزی. ئەو شادمان بوو، چاوەکانی هەر بریسکەیان دەهات. بە کیژێک دەچوو کە شتی جوانی شاردبێتەوە. دەمودەست بیرم کردەوە، لەوانەیە کەوتبێتە داوی خۆشەویستییەوە.

لەسەر مێزی چێشتخانەکەشدا، خوشکەکەم بە بزەیەکەوە سەیرێکی کردم. هەر یەکسەر ئەو خەندەیەی جارانم لەسەر لێوەکانی بینیەوە، کیژێکی شازدەساڵی بە خۆی و پرچێکی دوو کەرتەوە.

من کاتی خۆی بۆ ئەو باوکێکی جێگرەوە بووم. ئێستاش هەروەک جاری جاران هەڵسوکەوتم لەگەڵدا دەکا، وەک کاک، وەک برایەکی گەورە ڕەفتارم لەگەڵدا ناکا، بەڵکو وەک باوکێک. یەک دوو جاران ویستم دەستی بەسەر سەردا بهێنم. بەڵام زاتم نەکرد. دەستی ڕاستم ڕەق دەبوو، نەیدەویست لەجێی خۆیدا بجوڵێ.

ئای خوای گەورە، ئەرێ بۆچی نەوێرام؟

خۆم ئاگادار کردەوە، دەستم بەرزکردەوە، درێژم کرد، بە نەرمی خستمە سەر سەری و باوکانە دەستم بە پرچەڕەشە درێژەکەیدا هێنا.

## ١٣

# گەڕانەوە بۆ هوتێلەکە

**هەڵبەتە** بە هۆی ئەو پیر و کاڵانەی لە دەوروبەرم بووم، دەمزانی پیریێتی چییە، بەڵام پیربوونی دایک و باوکی خۆت شتێکە و تۆش دەبیتە شتێکی دیکە. هەر بۆیە تۆ باشتر لە ڕۆڵی چارەنووسسازانەی کات تێدەگەی.

من هەرگیز پێشتر ئەوەندەی ئێستا، ئەزموونم لەگەڵ کات پەیدا نەکردبوو. خۆ لە هەر ساتەوەختێکدا و لە کاتی ڕۆیشتنیشدا، دایکم لە ترکزە بوو، پێی بخلیسکێ، ساتمەیەک ببا، نەخێر، هەر ئەوەندەش نەبوو، کێ ناڵێ هەر ساتەوەختێکی دیکە دڵی لە لێدان ناکەوێ، پیلی من توند بگرێ، ئینجا تەواو بڕایەوە. مێشکی ئەو بەردەوام دەستەوەستان ببوو. ئەو نەیدەتوانی کۆتایی بە دەمەتەقێیەک بێنێ، چونکە هەندێک وشەی لەبیر نەدەمان و بۆی نەدەهات. ئەو پێی خۆی لەو جێ پێیەدا دەنا، کە نەدەبوایە لەوێ دایبنابایە. منیش توند باسکم گرتبوو، سەرەتا نەیدەویست بیگرم، بەڵام لەکۆتاییدا ملی دا و گوتی: "بەڵێ، لەوانەیە وا باشتر بێ. ئێرەش هەندێک تاریک بووە، ئەو هەموو تیشکەش لەچاوم دەدا، باش نابینم تا پێیەکانم باش دابنێم."

هەنووکە بۆ یەکەمین جار لە ژیانیدا، ڕێگەی دام بە توندی قۆڵی بگرم و بەری نەدەم، ئیدی ئەوکات پەیم بە ڕاستییێکی دیکە برد، کە پێشتر دەرکم پێنەکردبوو. ئەوەش ئاگاداربوونەوەیەک بوو، کە پیربوون ڕاستی دیکە نیشانی هەردووڵامان دەدا. من دەمزانی تەمەنم هەڵکشاوە، بەڵام ئەوەندەش نا تا خۆم بە پیر بزانم.

دیسان دایکم باسی مەرگی باوکمی بۆ کردمەوە، وەک ئەوەی هەر دوێنێ بێ ڕوویدابێ: "ئەو هەمموو دوای نیوەڕۆکە لە باخچەکەدا سەرقاڵ بوو. منیش لەپشت جامی پەنجەرەکەوە سەیری دەرێم دەکرد و بانگی ژوورەوەم دەکردەوە، بەڵام خۆ لە هیچ شوێنێک دیار نەبوو. ئەو کاتەی چاوم بە جووت پێڵاوێکی پیاوانە کەوت، لە بن گوڵەکان دیار بوون. بەدەستی لەرزۆکەوە دەرپەڕیم و گوڵەکانم لادان و بینیم باوکت ڕاکشاوە، هەروەک ئەوەی خەوی لێکەوتبێ."

ئەم گێڕانەوەیان زۆر جیاوازتر لەوەی کە یەکەمین جار بۆی گێڕابوومەوە. بەگوێرەی گێڕانەوەی یەکەمین جاری، باوکم لە دەرەوەی گەڕەکەکە، بەنێو ڕەزی تریدا دەڕۆیشت، لەوێ فشاری دڵ لێیدابوو، بە پشتدا ڕاقەنابووە نێو تەڕاشێک. ماڵباتەکەش بەدوایدا گەڕابوو، نەیاندۆزیبووەوە، تا ئەو کاتەی بە سەدان قەلەڕەش لەو ناوەدا و لەسەر ئەو شوێنەی لێی کەوتبوو، قیغاندبوویان.

کاتێکیش گەڕاینەوە هوتێلەکە، ئەنگۆرەیەکی درەنگ بوو، هۆڵی چاوەڕوانییەکەش چۆڵ و هۆڵ بوو. بە بێ مراز، من چاوم بە دوای «نەستەرەن»، ڕێنوێنی گەشتەکەماندا گێڕا، بەڵام خۆ ئەویش چووبووە ماڵی خۆی. لە نەبوونی ئەودا، هۆڵی چاوەڕوانی هوتێلەکە بە وێنەی گەورۆنە گەورۆنەی شێخ زاید بن سوڵتان ئال نەهەییان و شێخ محەمەد بن ڕاشد ئال مەکتووم باڵکێش بوو.

لەنێو ئەسانسێرەکەشدا تووشی دیمەنێکی زۆر سەرنجڕاکێش بووین. لەوێدا خۆ هەر من بە تەنیا نەبووم، کە پیلی پیرە دایکی توند گرتبێ، بەڵکو یەک دوو پیاوی دیکەی هاوتەمەنیشم هەمان شت بوون، هەمووشیان هەر

ئێرانی بوون، وەک من نەیاندەتوانی بگەڕێنەوە نیشتمان. ئیدی سڵاومان لەیەک کرد و هیوای مانەوەیەکی خۆشمان لە «دوبەی» بۆ یەکدی بە ئارەزوو خواست.

ئەوکات بۆم دەرکەوت، کە ژمارەیەکی زۆر لە ئێرانییەکان لەو هوتێلە دابەزیون، پێدەچوو پەیوەندییێکیان بەو نووسینگە گەشتیارییەی ئێران-دوبەییەوە هەبێ. هەڵبەتە هەر بۆیەشە «نەستەرەن» هەموو ڕۆژەکەی لە هۆڵی چاوەڕوانی هوتێلەکە ئامادە دەبوو. ئەمەش بۆ ئەوە بوو تا ڕێنوێنی گەشتیارە ئێرانییەکان بکا، لە پێشوازیاندا بێ و بەڕێشیان بکا.

ئێمە گەیشتینەوە سویتەکەمان و یارمەتی دایکم دا تا چاکەتەکەی دابکەنێ.

ژنەکەشم کە پێویستی بەوە هەبوو، هەندێ بە تەنیا بێ، بە دایکمی گوت: "دایکە، یاوەریت بکەم، بتبەمە ژوورەکەی خۆت؟ تۆ ڕۆژێکی دووروودرێژ هەر بە پێوە بووی، هەر دەبێ زۆر ماندوو ببووی؟"

بەڵام خۆ دایکم نەیدەویست جارێ بنوێ، ئەو چووە بەردەم جامی پەنجەرەکە و لە دەرەوە ڕاما.

ژنەکەم پێشتر گوتبووی، وا باشترە دوو ژووری جیا لەیەک لە هوتێلەکە بگرین، بۆ ئەوەی هەر یەکەمان هەندێ تایبەتمەندی کەسایەتی خۆی هەبێ و بیپارێزێ، بەڵام من لەگەڵی هاوڕا نەبووم: "خۆ ماوەکە هەر بۆ چەند ڕۆژێکی کەمە، دەی با هەموو بە خۆشییەوە بەیەکەوە بین."

هەنووکە تێگەیشتم، ژنەکەم لەسەر هەق بوو، چونکە وەها دیاربوو، دایکم جارێ بەنیاز نەبوو بچێتە سەر جێگەی خۆی و بڕازێ. ئەو بە پەنجەرەکەی وەگرتبوو، لێیخۆش هاتبوو سەیری دەرەوە بکا.

من بانگی دایکمم کرد: "ئەرێ چی لەو دوورە هەیە؟"

بۆ لای ئەو ڕۆیشتم و سەیری دەرەوەم کرد. کەنداوی فارس بەو پاپۆڕە زل و زەبەلاحانە وەک بوونەوەرێکی ئەفسانەیی، لەو شەوەدا دیمەنێکی دڵڕفێنی هەبوو.

- "بەمە دەتوانی سەیری بکەی، بەمە زۆر باشتر دەبینی." من بەدەم ئەم قسانەوە، دووربینەکەم ڕادەست کرد.

ناکارامەییانە دەستی دایە دووربینەکە و بە بەر چاویەوە گرت.

- "خۆ هیچ دیار نییە."

منیش لێم وەرگرتەوە، بە چاوی خۆمەوە نا، لێنزەکانم سوڕاندن و ڕاستم کردەوە.

- "ئێستا، دەتوانی باشتر پێی ببینی. ئەوەی دەجووڵێ ئەوە شەپۆلەکانی کەنداوی فارسین، ئەو چرا ئەفسووناویانەش کە دێن و دەڕۆن هی پاپۆڕە زەبەلاحە نێودەوڵەتییەکانن. ئەو تیشکەش کە لە دوورەوە بە کزی دیارە، پێموابێ هی ئێمەیە، هی ئەو وڵاتەیە کە تۆی لێوە هاتووی و منیش زۆر غەریبی دەکەم."

دایکم بە چاوە پیرەکانی سەیرێکی کردم، وەک دایکێک کە کوڕەکەی سەری لە شتێک دابێ و ژانی کردبێ. دیسان بە ناکارامەییانە دەستی دایەوە

دووربینەکە و بە بەر چاویەوە نا، هەوڵیدا کەشتییەکانی نێو دەریاکە ببینێتەوە.

من چوومە لای پەنجەرەکەی دیکە، دیمەنێکی سوریالییانەی بیابانی نیشاندەدا. لە دوورەوەش، لە ئاسمان، دەریایەک لە ڕوناکی و تیشک دیاربوو. ئەوەش هەر پارچەیەکی کاکێشان بوو، گورزە تیشکێک کە لە ئەستێرە بێژمارەکانەوە دەهات.

- "دایکە، وەرە ئێرە و سەیری ئەو پەڕجووەی ئەوێ بکە."

بە خۆی و دووربینیەکەی دەستی، هاتە لای من. یارمەتیم دا تا بە دووربینەکە سەیر بکا و جوان ببینێ.

- لێم پرسی: "دەیبینی؟"

- "نەخێر، هێشتا نا. ئۆووو، بەڵێ، دەیبینم، ئەرێ ئەو شتە چییە؟"

- "دایکە، ئەوە ڕێی کاکێشانە. لە بیاباندا بە شێوەیەکی تەواو جیاواز دەردەکەوێ. بە ملیاران ئەستێرە ئەو ڕووبارە ئەفسووناوییەی تیشک و ڕوناکی دروست دەکەن."

دایکم بە بێدەنگی سەیری دەکرد. بینیم دەستەکانی کەوتنە لەرزە.

من نەمدەزانی، لە ڕاستیدا ئەوەم لەبیرچووبووەوە، بەگوێرەی دابونەریتی ئێمە، بینینی ڕێگەی کاکێشان، نیشانەی ڕێگە بوو بەرەو مەککە. من ئەمەم هەر لە تافی منداڵییەوە دەزانی. کاتێ لە شەوانی ڕوونی گەرمای هاویناندا دەچووینە سەربان، لەوێ جێگەیان ڕادەخست و دەنووستین، لەو سەربانانە ئەو پەڕجووەی کاکێشانمان لە بانی سەرمانەوە، لە ئاسمان دەبینی.

- "هەموو ئەو ئەستێرانە بەرەو مەککە دەڕۆن." دایکم ئەو قسەیەی پێدەگوتین، لەکاتێکدا ئێمە لەبن لێفە گەورەکاندا ڕوومان بەلای ئەودا وەردەگێڕا.

ئێستاش دایکم بە دووربین سەیری هەمان ڕێگەی کاکێشان دەکا، بە دووربینیش ئەستێرەکان نزیکتر دیارن، هەروەک ئەوەیە لە دەرەوەی جامی پەنجەرەکە بن. لە ڕێی ئەو دیمەنە تەلیسماوییەی ئەستێرەکان نمایشیان دەکرد، دایکم دەستی لێدرا، دیسان چووەوە نێو ئەو جیهانەی کە مێشکی دەهەژا و شتێکی دیکەی لێدەکەوتەوە.

ئیدی دووربینەکەی دانا و سەرسامانە تەماشای کردم، بەلام هێشتاش، تێنەگەیشتبووم ئاخۆ چی لە ئارادایە.

منیش بە خەمخۆرییەوە لێم پرسی: "دایە چیتە؟"

بە نەرمییەکەوە گوتی: "مەککە؟"

من ترسام لەوەی شتێکم گوتبێ، کە نەتوانم بیگێڕمەوە. لەگەڵ ئەوەشدا هەر هەوڵێکم دا: "دایکە، نا، نەخێر، ئەوە هەر قسەی لەسەر نییە، بەلام خۆ لەڕاستیدا تۆ ڕاست دەکەی. لێرە باشتر دەبیندرێ. ئەستێرەکان بە ڕوونی بەرەو لای باشوور دەجووڵێن، بە ئاراستەی کۆتایی بیابانەکە دەڕۆن، ئەو شوێنەی کە مەککەی لێیە."

بەلام خۆ ڕوونکردنەوەکەم، کارێکی پێچەوانەی کرد. سەیرێکی کرد بزانێ ئاخۆ ژن و خوشکەکەم لەوێ ماون و گوێیان لە ئێمەیە، بەلام خۆ هەر یەکەیان چووبووە ژوورەکەی نوستنی خۆی. وەک ئەوەی کەسێک نهێنییەک بدرکێنێ، سەری هەندێک هێنایە پێش و بە چرپەیەکەوە گوتی: "بەڕاست وایە؟ ئێمە بە ڕێگەوەین بەرەو ...."

منیش پێمگوتەوە: "نەخێر، دایکە، بوەستە، جارێ بوەستە، خۆ من بەهیچ شێوەیەک مەبەستم ئەوە نەبوو. مەککە زۆر دوورە، دەکەوێتە کۆتایی بیابانەکەوە. من مەبەستم بوو بڵێم، ئەستێرەکان لێرە، لە بیاباندا زۆر لەیەک نزیکن."

بەڵام بە خۆشم گومانم هەبوو ئاخۆ قسەکەم دەیخوا یان نا.

دواتر هەستمکرد کە من ڕاستەوخۆ، ئاراستەی شتەکانم لای ئەو وروژاند. ئیدی بە نائاگایی ئەوم بەرەو ئاراستەی مەککەوە برد. چونکە خەیاڵی گەشتی دایکم بەرەو مەککە مێژوویێکی دووروودرێژی هەبوو، هەر خۆی باشی لێدەزانێ بیگێڕێتەوە.

منیش پەشۆکام. ئاخر چۆن بوو، من بووم ختووکەی پێشنیازەکەم دا؟ هەر دەبێ منیش لە نەستەوە، ویستبێتم بچمە مەککە، یاخود هەر بەڕاست دایکم دەیویست من لەگەڵ خۆی بباتە ئەوێ و خەونەکەی بەدی بێنێ. باشە ئەگەر ئەو گەشتە لەڕاستیدا، ئەنجام نەدرێ، چی تێدایە ئەگەر بە خەیاڵ بکرێ؟

لەپڕێکەوە دایکم گوتی: "خۆ تۆ کاتی خۆی بەڵێنێکت پێدابووم."

ئەوە ڕاست نەبوو. من هەرگیز بەڵێنێکی وام پێنەدا بوو. لەوانەیە ئەو، ئەو شتەی لە باوکم ڕەچاو کردبێ، بەڵام خۆ ئەو نەیدەزانی کە مەککە لە کوێیە. خۆ ئەو هەر نەشیدەزانی ئاخۆ خوا یان ئەڵلا چی دەگەیەنێ.

بۆ ڕۆژی پاشتر زانیم، کە دایکم ئەو قسەیەی لە کوێ هێنابوو. خۆ من بەڵێنم پێنەدابوو، بەڵکو ئەو بوو، لە تافی منداڵیمدا بەردەوام لە مێشکی منی چەقاندبوو: "تۆ، بەڵێ هەر تۆ، لەگەڵ خۆت دەمبەیە مەککە!"

"دایکە، تۆ هیلاک بووی، دەی بابتگەیەنمە هۆدەکەی خۆت." وام پێگوت و پیلیشم گرت.

ئێستاش دەبێ من چاوەڕێ بکەم، لەوانەیە جارێکی دیکە بگەڕێتەوە دنیای ڕاستی، ئینجا هەموو ئەو شتانەی دەربارەی ئەوەی کە لە کۆتایی بیابانەکە، مەککەیە، ئەو مەککەیەی کە ماڵی ئەڵڵای لێیە، لەبیر بکا. دەشبینین ئاخۆ بەیانی چی بۆ هەڵگرتووین. سەرەتا دەبێ منیش بچمە نێو جێگەکەم و بڕازێم.

## ١٤

# لەنێو پێخەفدا

**چوومە** سەر جێگە، درێژ بووم، بەڵام خەوم لێنەکەوت. دەمویست لەگەڵ خێزانەکەم، سەبارەت بە گفتوگۆی دایکم هەندێ قسە بکەم، کەچی ئەوەشم نەکرد. وا باشترە هەر لە واقیعدا بمێنێتەوە. ئاخر لەوانەیە ئەو گفتوگۆیە ئاراستەیەکی دیکە وەربگرێ.

"ئەرێ کەنگی ئەو خەون و خەیاڵانەی تۆ دەوەستن،" گوێم لێبوو ژنەکەم وای پێگوتم؛ "خوشکەکەشت هەر وایە، هەروەک ئەوانەیە کە لە خەودا دەڕۆن."

من لە شوێنی خۆم بێدەنگ مامەوە، هەر بیرم لێدەکردەوە. ژنەکەم ڕاست دەکا. خوشکم بە شێوەیەکی ئاسایی ناڕوا. ئەو مەلە دەکا. هەندێ جار کە لە تەنیشتمەوە دەڕوا، هەستێکی وام لا پەیدا دەبێ، هەربینا باڵی گرت و فڕی.

ئێستاش کە لەسەر جێگەم، جڵەوی دڵغە و خەیاڵم لە دەست دەرچووە، لەنێو هزرەکانمدا بۆ هەموو لایەک پەل دەکوتم. خۆم وا دەبینییەوە، باسکی دایکم توند گرتووە، لەکاتێکدا بە یەکەوە بەرەو کەعبە دەڕۆین. ئێمە هەر هەردووکمان بووین، کەسی دیکە لە گۆڕەپانەکەدا نەبوو. شتەکەش هەروەک ئەوە وابوو، کە من، دایکم بۆ خواردنەوەی کوپە قاوەیەک لەگەڵ خۆم ببەمە ماڵی ئەللا.

ئیدی لەویَ پەردە سادەکەی ماڵەکەیم لادا، یارمەتی دایکمم دا تا بچێتە ژوور و ئینجا بانگی کرد "سەلامون عەلەیکوم." ئەمەشی بۆ ئەوە بوو تا خودانی گەورە ئاگادار بکاتەوە، کەوا ئەو گەیشتووە.

ئەم دیمەنە، پەردەکە، هەر خۆی بوو، هەر دایکم بوو کە ئاخنیبوویە نێو خەیاڵ و ئەندێشەم. ئاخر ئەو هەمیشە لە پشت پەردەدا دادەنیشت تا هەکایەتەکان بگێڕێتەوە. زۆر جاران ئەو منی لە گەڵ حەکایەتەکانی خۆیدا دەبردە کەعبە تا خواوەند ببینین.

ژنەکەم پێی گوتم؛ "خێرە بێدەنگی."

- "ئۆو، هیچ نییە، بیر لە دایکم دەکەمەوە. ئەو بەردەوام لە نێوان واقیع و خەیاڵدا مەلە دەکا و منیش لە گەڵ خۆیدا دەبا."
من بە خۆشییەوە حەزم دەکرد، دەربارەی دایکم بدوێم، بەڵام واشم نەکرد. لەڕاستیدا هزرەکانم هزر نەبوون، بەڵکو کۆپلەیەک لە خەون و خەیاڵ بوون، نەدەکرا ڕوون بکرێنەوە.

پێموابوو، خێزانەکەم چاوەڕێی وەڵامی من دەکا، بەڵام خۆ ئەویش لێی نوست.

هێشتاش خەوم لێنەدەکەوت، بە ئەسپایی لەنێو جێگەدا هەڵسام و چووم ببینم، ئاخۆ دایکم باش درێژ بووە.

بە لای ژوورەکەی خوشکمدا ڕۆیشتم، دەرکەکەی تی درابوو، گڵۆپەکە کوژابووەوە. گوێم لێبوو لەبەر خۆیەوە لە نوستنەکەیدا قسەی دەکرد. بە ڕوونیش دیاربوو لەگەڵ یەکێک دەدوا، منیش نەمدەویست گوێی لێهەڵبخەم، بەڵام بە هۆی یەک دوو وشە کە بەرگوێم کەوتن، خاترجەم بووم لەگەڵ کێ قسە دەکا. خۆی هەر دەبوایە بمزانیبایە، ئاخر لێی دەپرسی، بەڵکو بۆ

یەک دوو ڕۆژ باخی دار بادەمەکان بەجێبێڵی و بێتە ئێرە، بێتە دوبەی و لەگەڵماندا بی. ئاخ «جەواد»!

لەوێ ڕۆیشتم و چوومە ژووری دانیشتن، لە پشت جامی پەنجەرەکە وەستام و سەیری دەریام کرد. لە چێشتخانەکەدا، خوشکم وەڵامی ئاماژەی دەستەکانمی نەدایەوە. لە مێشکی خۆمدا، هێشتا هەر بەو دیمەنە سەرقاڵ بووم. چوومە لای مێزەکە و لەسەر کورسییەکە دانیشتم و کۆمپیتەرەکەم کردەوە، هەوڵمدا ئەو گفتوگۆیە بخەمە نێو چیرۆکێک.

بە ئاماژەوە پێمگوت؛ *من ئەو هەستەم هەیە، تۆ لەسەر من خرابیتە زیندانەوە.*

*نەخێر، نا، تۆ نابێ ئەو قسانە بکەی. ئەگەر وا بیر بکەیتەوە، ئازارم دەدەی،* خوشکم بە ئاماژەوە وای پێگوتمەوە، بە هۆیەوە بروسکەیەک پشتمی تەزاند.

"بۆ منیش مایەی ئازارە ئەگەر سەبارەت ئەو هەموو ساڵانە هیچ نەڵێی. ئایا شتێک دەربارەی مەرگی جەواد دەزانی کە من نەمزانیبێ؟ خۆ من مافی ئەوەم هەیە بیزانم. دەی خەیاڵەکەم سنووردار بکە، لێمگەڕێ با بە هەردوو قاچەکانم لەسەر زەوی بوەستم."

لەوە زیاتر بۆم نەهات.

ئیدی کۆمپیوتەرەکەم داخستەوە.

## ١٥

# نەستەرەن

بۆ بەیانییەکەی، دوای قاوەڵتی لە نهۆمی حەفتەمی هوتێلەکەدا، کە مەلەوانگەیەکی گەورە، هۆڵی وەرزش و ساوناشی تێدابوو، بۆ وەرگرتنی زانیاری زیاتر دەربارەی سەردانکردن و گەڕان و سوڕان، کە دایکیشم لەگەڵ خۆمدا ببەم و هەندێ شوێنی نیشانبدەم، چوومە خوارەوە، بۆ هۆڵی چاوەڕوانی.

بەختەوەر بوم، دایکم لەسەر قاوەڵتییەکە هیچ باسی مەککەی نەکرد. هیواداربووم ئەو بیرۆکانەی لە پشت خانەکانی مێشکهەژانەکەیدا شاردبنەوە.

کاتێک چومە لای پرسگەکە، تا چەند بڵاونامەیەکی گەشتیاری تەماشا بکەم، چاوم بە «نەستەرەن» کەوت. ئەو لە نزیک وێنە گەورەکەی شێخەکان لەگەڵ یەک دوو گەنجی ئێرانی وەستابوو، قسەی دەکرد. کاتێکیش منی بینی، ئەو دەستەی بۆ بڵندکردم کە یەک دوو کاغەزی پێگرتبوون، واتای ئەوە دەگەیاند: *کەمێک بوەستە، پێویستە بتبینم.*

منیش هەندێک لە دوور وەستام، هەندێ بە تەمومژاوی گوێم لێبوو ئاخۆ باسی چی دەکەن. تومەز، ئەو گەشتەیان یەکەمین گەشتی ئەو گەنجانە بوو بۆ دەرەوەی وڵات، دەیانویست ئازادانە لە «دوبەی» کاتی خۆش بەسەربەرن، چونکە ئەوەیان لە ئێران بۆ نەدەچووەسەر.

ئەوەش ئازاری دەدام کە بینیم ئەو لاوانە، نەیاندەزانی ئازادی بۆ ئەوان واتای چی دەگەیەنێ، چۆن ئەوان گەورە دەبن و گەشە دەکەن و

بەهرەکانیان پەرەدەسێنێ. زۆربەی گەنجان کە دەهاتنە «دوبەی»، دەمودەست بە دوای بارێک یان دیسکۆیەکدا دەگەڕان، یاخود دەیانویست بزانن، ئاخۆ لە کوێ کۆنسێرتێکی هونەرمەندانی ئێرانی، ئەوانەی لە ئەمریکادا دەژین لە دوبەیدا هەیە، یان شتێکی وا ڕێکخراوە. ئەوان هەر خواردنەوە و بەزموڕەزمی گۆرانی و سەمایان دەویست.

«نەستەرەن»یش بە پشوودرێژی و بە وردەکارییەوە پێی دەگوتن، بۆ کوێ بچن، دیسکۆکان لە کوێن، هونەرمەندە ئێرانییەکان لە کوێ نمایشی خۆیان دەکەن و نرخەکانیشیان چەند و چۆنە.

لەو نێوەدا یەک دوو کەسی دیکەش پەیدابوون، ئەوانیش هەمان زانیاریان دەویست. «نەستەرەن»یش بە خەندەوە چاوێکی تێکردم و ئاوڕی لە من دایەوە، واتای وابوو: ببوورە، *وام لێکردی هەندێ چاوەڕێم بکەی، زۆر ناخایەنێ، هەر ئێستا دێم.*

منیش ئاماژەم بۆ کردەوە: *پەلەی ناوێ، دەچمە ئەوێ لەسەر قەنەفەکە دادەنیشم.*

چوومە لای پرسگەکە، دەستم دایە یەک دوو بڵاونامە و لەسەر قەنەفەیەکی پێست بۆرە، لەژێر وێنە گەورەکەی شێخەکان لێی دانیشتم.

لەپڕێکەوە ئاماژەیەکی خۆییم لە جەستەمەوە بۆ هات: *ئاگاداربە! ئەو «نەستەرەن»ە کار بۆ دەزگای هەواڵگریی نهێنی ئێرانی دەکا. ئەو شۆفارێکە.*

من زۆرجاران بەزموڕەزمی شۆفارەکانم بینیوە، ئاخر لە هۆڵەندا و لە وڵاتەکانی دیکەدا بە هۆی کتێبەکانمەوە سەروسەودام لەگەڵ ئەو شتانەدا

هەبوو. خۆی دەبوایە هەر زوو بمزانیبایە. ئەو ڕووخسارە شیرینە، ئەو خەندە هەڵخەڵەتێنە لەڕاستیدا هەستە خۆشەویستییە خۆزاکانمی بزواند و پەردەی بەسەر لایەنی لێتێکەیشتنمدا دا. هەمیشە ژنەکەم پێمدەڵێ: "ئێوەی پیاو لە بەرانبەر ئافرەتدا لاوازن، هەر زوو بە خەندەیەک دەکەونە داوەوە."

بەڵام خۆ من هێشتا نەکەتبوومە داوەوە.

من هیچ بەڵگەشم نەبوو، کە «نەستەرەن» شۆفارە، بەڵام خۆ پێویستیش بە بەڵگە نەبوو. ئەوە ئەزموونی خۆم بوو سەبارەت ئەو جۆرە کەسانە. کات و تەمەن وایان فێرکردم، کە دەبێ گوێم لە خۆم بێتەوە. بە خۆیشم لەو بڕوایەدا بووم، هیچ ئاگادارینامەیەکی ساختە لە جەستەمەوە هەڵناقوڵێ. من ئەو ئافرەتە ناناسم، بەڵام خۆم باش دەناسم. منیش بە دوای هەستی خۆڕسکی خۆمدا ڕۆیشتم، تەنانەت ئەگەر هاتوو بەرەو ڕێگەی هەڵەشمدا ببا. هەستی خۆڕسکییم تاکە ڕاوێژکارێکم بوو، هەمیشە بەگوێم دەکرد. ئەوەش متمانەیەکی مەحکەم بوو، ساڵانێکی دووردرێژ بو لە هەناومدا چەکەرەی کردبوو. هەستی خۆزاییەکەم، ڕووگەنمایەک بوو و منیش بە دوای ئاراستەکانیدا دەڕۆیشتم.

دەمودەست پارچەی مەتەڵەکان کەوتنە سەر مێزەکەی بەردەمم. نووسینگەی گەشتیاری لە لایەن شۆفارەکانی کۆماری ئیسلامیی ئێرانییەوە سیخناخ بووە.

پێویستیشم بەوە نەبوو، ئەو بەرەنجامە لەگەڵ کەسی دیکەدا تاوتوێی بکەم. ئەوە شتێکی تایبەتمەندی کەسیی بوو، بە دڵنیاییەوە هی ئەوە نەبوو نە لەگەڵ ژنەکەم، نە لەگەڵ خوشکەکەمدا باسی بکەم، ئەگەر وام بکردبایە، خۆشی و ئەو گەشتەم تێکوپێک دەدا.

من وام بیرکردەوە بەڵکو لیستێکی دیکەی سەرباری تێچوونەکانم بۆ بێنێ، بەڵام خۆ ئەوەش نەبوو. «نەستەرەن» ژنێکی ڕێکوپێکی نووسینگەی گەشتیاری بوو، هەموو شتێکی بە دروستی دانابوو، هەموو دیدارەکانی لەسەر کاغەزکانی تۆمار کردبوو. ئەوان هیچ پارەیەکی زێدەباریان داوانەکرد و هچ بەخشیشێکیشیان نەویست. ئیدی منیش لە خوارەوەی کاغەزەکانیان واژۆیەکەم دانا و هەموو شتێک بە جوانی بەڕێوەچوو. کەواتە هیچ لەگۆڕێدا نەبوو، تەنیا ئەوە نەبێ، نها من «نەستەرەن»م بە چاوێکی دیکە دەبینی.

# شۆفارەکان

**بۆچوونەکانم** شتگەلێکی دەستکرد نەبوون. من بایی خۆم ئەزمونم هەبوو تا بزانم دەزگای هەواڵگریی ئێرانی لە دەرەوەی وڵات چۆن دەجووڵێتەوە.

ئەوان بەتایبەتی لە ڕێی نووسینگەی گەشتوگوزار و کۆمەڵگە کلتوورییەکان کاریان دەکرد. ئەوان لە هەموو ئەو وڵاتانەی ئێرانی تێدا نیشتەجێن، کاران. ئەوان بۆ کۆڕ و کۆبوونەوە، بۆ کۆنسێرت و بۆ بۆنە و گردبوونەوەکانی دیکە دەچن، هەرچەندە ئەو بۆنانە لەگەڵ بنەماکانی ئەوانیشدا نایەنەوە. ئەوان کاری خۆیان بە ڕێکوپێکی ڕایی دەکەن و خزمەتێکی زۆری باڵادەستەکانیان دەکەن. بەم جۆرە چاوی ئەوان لەسەر هەموو کەسێکە.

زۆرجاران کە بەهۆی بۆنە و کۆڕە وێژەییەکان دەچمە وڵاتەکانی دیکە، توشی ئەو جۆرە شۆفارانە دەبم، یان دەمودەست پێیان دەزانم. من هەر بە خۆم دەتوانم ئاماژەشیان پێبکەم، بەڵام خۆ ئەوە شتێکی کەسییە، بۆیە بۆ کەسی باس ناکەم. باشە چی دەبێ ئەگەر جارێکیان لەو دەستنیشانکردنانە سەرچیخ بچم.

بەدەر لەو شۆفارە بێدەنگانە، کەسانێکیش هەن کە خوێندنی باشیان تەواوکردووە و کاری بەڵگەنامەیی جوان جوان دەکەن، کامێرای باشیان لەبەردەستە و ناوبانگێکی باشیشیان بۆ خۆیان پێکەوە ناوە و دەچنە هەموو شوێنێکیش.

یەکەمین جاریش کە ئەو جۆرە کەسانەم بەدیکرد، هەوڵمدا لێیان دووربکەومەوە، بەڵام دواتر لە دۆخەکە و ئەوان ڕاهاتم. خۆ من هەر دەمنووسی و کتێبەکانم چاپ و بڵاودەکردنەوە. هەر بۆیە شتێکم نەبوو بیشارمەوە. هەر پێویستیش نەبوو، لە حاڵەتێکدا، کە ئەوان ئامادە بووبان، پشتگوێیان بخەم.

خۆ ئەو شۆفارانە بۆ خۆیان دژوار نەبوون. هەمو ئەوەی ئەوان دەیانکرد، ئەوەبوو ئەوەی دەیانبینی دەیانخستە سەر کاغەز و ڕاپۆرتیان دەنووسی. ئەوان زانیارییەکانیان خڕدەکردەوە و دەیانناردە دەزگای نهێنی ئێرانی. بەڵام لە ڕێی ئەو زانیارییانەی ئەوان کۆیان دەکردەوە و دەیانناردەوە، زۆر جاران شتی ترسناک ڕووی دەدا. لەسەر بنەمای ئەو زانیارییانە، ڕژێم بەرهەڵستکارە کاراکانی خۆی لە دوبەی، لە تورکیا، لە سوریا و لە هەر شوێنێک دەستی پێگەیشتبایە بوایە لەناودەبرد. ئەوان، ئەو جۆرە کەسانەیان دەڕفاند، دەیانخستە نێو بەلەمێک و ئینجا ئێران خۆت بگرە هاتم.

بە دەیان لەو جۆرە تاوانانەم دەزانی کە لە هەندەراندا دەکران. لە هەموو چێشتخانە گەشتیارییەکان، لە هوتێلەکان، لە دیسکۆکان، هۆڵی کۆنسێرتەکان و لە هەر شوێنێک کە دەستیان بگەیشتبایێ، خەڵکی خۆیان دەدۆزییەوە. دەیانتوانی هەر لەنێو ترۆمبێلەکەتدا تەقەت لێبکەن و لەو جێدا ساردت بکەنەوە و پاشانیش وەک بەرزەکی بانان بۆی دەرچن.

کاتێکیش من بەو بڵاونامە گەشتیارانەی دەستم، لە بەردەم ئەسانسێرەکە وەستام تا پێی بچم سەرەوە، دیسان تووشی «نەستەرەن» بوومەوە.

– "ئەرێ دایکت چۆنە؟ من دەبوایە پێشتر بمپرسیبایە، بەڵام لەبەر جەنجاڵی هەر پێمنەکرا."

- ˙باشه، بەڵام نازانم چۆن بۆت ڕوون بکەمەوە، بە هۆی ئەو بارە وروژاوییەی تێیدایە، هەندێکجار سەری لێ تێکدەچێ.˙
- ˙لەوە تێدەگەم، ئەوە لای من نامۆ نییە. دەی، ئەگەر ویستت بڕۆیتە شوێنێکی دیکە، پێمبڵێ، بەڵکو بتوانم یارمەتیتان بدەم.˙
- ˙هەڵبەتە، من زۆر لە خزمەتگوازرییەکانی ئێوە ڕازیم.˙
- شایانی نییە، ئێمە کاری خۆمان دەکەین.˙ ئەو وای پێگوتم و ئاماژەی بە بڵاوکراوەیەکی گەشتیاری دا کە لەنێو دەستم دابوو، ئینجا گوتی: ˙دەبینم بە تەمای گەشتێک بەو دەشت و دەرەدا بکەی؟˙
- ˙بەڵێ، کاتێ تۆ لێرە بیت، هەر دەبێ شتێک بکەی، بەڵام دۆزینەوەی شوێنی خۆش و باش زەحمەتە، بەتایبەتی شوێنێک کە بۆ دایکم دەستبدا.˙
- ˙شتەکەش ئەوەندە سەخت نییە. ئێمە گەشتی دەشتودەری زۆر خۆشمان هەن و تێچوونەکەشیان بەقەد نێوی تێچوونی ئەوەیە کە هوتێلەکە دایناوە.˙

«نەستەرەن» خەندە گرتی، ئەوەندە ژنانە و ئەوەندە خۆش و شیرین، ئەوەندەش متمانەبەخش، هەر زوو زمانی پەشیمانی خۆم گەست، کە پێشتر وەک شۆفارێکم لە قەڵەمم دابوو.

- ˙باشە ئێوە چ گەشتێکتان بە دەستەوەیە؟ دەمەوێ بیزانم و بەڵکو دایکیشم لەگەڵماندا بێ.˙
- ˙کێشە نییە. ئێمە زۆر کەسی بە تەمەنمان وەک مەعمیل هەن. هەربۆیە شوێنی گونجاومان بۆ ئەوان هەیە. من نازانم تۆ بەدوای چیدا دەگەڕێی، بەڵام هەر بۆ نموونە ئێمە دەتوانین گەشتێک بەناو بورجە بەناوبانگەکانی دوبەیدا بکەین و بچینە دورگەی دارخورما، شوێنێکی نموونەیی و ناوازەی دڵڕفێن، کە خانووەکان لەسەر ئاو ڕۆنراون، یان دەکرێ سەردانی ئەو باخە گەورەیە بکەین، کە بەشێوەیەکی تایبەت میوەی لێ چاندراوە و موتوربە کراوە.˙

لە کاتێکدا قسەی بۆ دەکرم، منیش تەماشام کردبوو، لەوانەیە بە تەواوی سەرم لێتێکچووبێ. مرۆڤ خۆی بوونەوەرێکی ئاڵۆزە، خۆ دەبێ ئەو، هەر کارمەندێکی نوسینگەی گەشتیاری بێ و هیچی دی. ئەو هیچ سەرپۆشی نەبوو، پێش نەدەچوو سەر بە ئەوانە بێ کە پێیان دەگوترێ موسلیمە[22]، کەواتە لە ڕووخسارەکەیدا پێناچێ دەستی لەگەڵ دەزگای هەواڵگریی نهێنی ئێرانیدا هەبێ. ئەو کاری خۆی وا بەڕێکوپێکی دەکا و نووسینگەی گەشتیارییەکەش کاری دروست و فیتە، هەر دەڵێی کاتژمێرێکی قورمیشکراوە. من دەمزانی، دەمبینی، بەڵام هێشتاش کاری لە بەرەنجامی لێکدانەوەکان نەدەکرد. خۆ منیش هەر مرۆڤ بووم، نەمدەتوانی هزرەکانم بەلاوە بنێم.

شتێک لە ناخمدا پێی دەگوتم، ئەو دەستی لەگەڵ دەزگای نهێنییدا تێکەڵە.

خۆی دەبوایە خۆم لەو ئافرەتە بە دوور بگرم. بەڵام ئەو وازی لێنەهێنام، دەستی لێنەشوشتم، منیش ئەوم وەک کەسێکی نێو نۆڤڵێتەکەم دەبینی.

خۆ ئەوەش دەبێ، لە ڕێی ئەنتەرنێتەوە یا لە ڕێی دیکەوە دەربارەی منی خوێندبێتەوە، هەر بۆیەشە پەرۆشیەتی کە یارمەتیم بدا.

– "ئۆو، خۆ من بە شتێکی باشتر دەزانم." لەو کاتەدا ئەوەی پێگوتم، کە بینی من دڕدۆنگم؛ "ئێمە دەتوانین لە کۆتایی ئەو دوای نیوەڕۆیەدا، کورتە پیاسەیەک بەنێو بیاباندا بکەین و چۆنیەتی ڕۆژئاوابوونیش لەوێدا

---

[22] موسلیمە: وەک پێشتر لە ڕۆمانەکەی "خانووەکەی مزگەوتێ" ڕوونکراوەتەوە، ئەو ئافرەتانەن کە لەگەڵ پۆلیس و ئاسایشی ڕژێمی کۆماری ئیسلامیدا کار دەکەن، تا بە زۆر سەرپۆش بەسەر ژناندا بدەن و ئەو جلوبەرگانەیان پێ لەبەربکەن کە لە لایەن ڕێسای ڕژێمەوە ڕێپێدراوە.

ببینین. هەر بەڕاستیش دڵڕفێن و سەرنجڕاکێشە. پاشان دەچینە کاروانسەراکەی ئەوێ، دەکرێ خۆت و خێزانەکەت لەوێ نانی شێوان بخۆن و گوێ لە موزیک بگرن و چاو لە سەماش بکەن. هەر بەڕاستیش شتێکی خۆشیش دەبێ بۆ دایکت."

هێشتاش هەر دوودڵ بووم. لەوانەیە هەر بۆیەش شتێکی دیکەیشی خستەسەر؛ "من تایبەت بە تۆ، لەڕاستیدا بۆ دایکت، گەشتێکی دیکەشی دەخەمە سەر. دەتوانم ئەوەتان بۆ ڕێک بخەم کە جیێبێک بێت و هەڵتانبگرێ و کەمێک بەسەر گردەلمینەکاندا لێبخورێ. هەر بەڕاستی مایەی سەرنجدانە."

جارێکیان فیلمێکم دەربارەی ئەو جێب و گردەلمینانە بینیبوو، دەمزانی لێخورەکە چۆن بەسەر گردەکاندا هەڵدەگەڕا و دادەبەزیەوە، هەروەک ئەوەی دێوانەیەک بە نشێوەکانی گردەکاندا شۆڕ ببێتەوە، وابوو. من لێیدەترسام، بەدڵنیاییشەوە نابێ دایکم بۆ سواربوونێکی وەها لەگەڵمدا بێ.

پێم گوتەوە: "ئەو لێخوڕینە لە سەر لم شتێکی زۆر سەرچڵیانە و مەترسیدارە."

"بەڵێ وایە، بەڵام خۆ شوفێرەکانمان بە ئەزموونن، ئێمە هیچ شتێکی سەرشێتانە لەگەڵ مەعمیلەکانماندا ناکەین. زۆر جاران ئەو کارە لەسەر داوای گەنجان دەکەین. هەر پێویست ناکا لەو بارەیەوە خەم بخۆی و نیگەران بی."

من هێشتا پرسیارێکم مابوو، دوودڵ بوم ئاخۆ ئەو گەشتە بۆ ئێمە گرنگە. لەگەڵ ئەوەشدا هەر پرسیم: "تۆش لەگەڵمان دێی؟"

خەندەیەک کەوتە سەر لێوەکانی، کەمێک بیری لێکردەوە، ئینجا گوتی: "بە شێوەیەکی ئاسایی، من لەگەڵ مەعمیلەکاندا بۆ ئەو گەشتانە ناچم. بەڵام ئەگەر وا بخوازی، دەکرێ وەها ڕێکی بخەم و منیش لەگەڵتان بێم."

کاتێکی ئەوتۆشمان لەبەردەستدا نەبوو، دەبوایە بڕیارێک بدەم.

منیش پێم گوتەوە: "ئەگەر تۆ بێی، ئەوا ئێمەش دێین."

ئیدی گەشتەکە ڕێکخرا

## ١٧

# بە جیپێک لە بیابان

لە دوای نیوەڕۆ درەنگەکە، لە هۆڵی چاوەڕوانی هوتێلەکە وەستابووین، چاوەڕێی جیپەکەمان دەکرد. ژنەکەم نەیدەویست لە گەڵمان بێ، ئاخر ئەو پێشتر هەمان گەشتی لەگەڵ برادەرەکانی کردبوو، ئێستاش دیدارێکی لەگەڵ خێزانی برازاکەی هەبوو.

ئیدی جیپێکی گەورەی زەردباو لە لای شۆستەی بەردەمی هوتێلەکە وەستا. نەستەرەنیش هات بانگمان بکا، سواری جیپەکە ببین و بۆ نێو بیابان تێبتەقێنین.

منیش هەر دەبوایە پێبکەنم، ئاخر ئەوە هەر لە گرتە دیمەنێکی نێو فیلمەکانی سینەما دەچوو، پێشهاتێکی سەرنجڕاکێشی گەشتەکەمان بوو. هەر خۆی لە خۆیدا سواربوون و دانیشتن لەنێو جیپێکی وا زلدا، دیمەنێکی ئەندێشاوی بوو.

ئیدی بەیەکەوە لەگەڵ نەستەرەن، پیلی دایکم گرت و سواری جیپەکەمان کرد و پشتێنی سەلامەتیشمان توند قایم کرد. من و خوشکەکەشم لە تەنیشت دایکم دانیشتین هەریەک لە سەرێکەوە. «نەستەرەن»یش لەسەر کورسی پێشەوە لای شوفێرەکە جێگەی خۆی گرت.

پێشتر هەرگیز سواری شتێکی لەو جۆرە نەببووم، وەک ئەوە دیار بوو سواری تراکتۆرێکی زەبەلاح ببم. ئاخر خۆ ئەو جۆرە جیپانەی بیابانیان تەیدەکرد، هەر لەنێو فیلماندا دەتبینین. کاتێکیش بە ڕێگەی شێخ زایدا دەڕۆیشتین، خۆمان بە بەرزی زیاتر لە یەک مەترەوە لە سەرووی هەموو

ترومبێلەکانی دیکە دەبینییەوە. دایکیشم بە ترسێکەوە سەیری ئەم لاو ئەولای دەکرد، لەهەمان کاتیشدا پێی خۆش بوو. ئەرێ تۆبڵێی ئەوە چی بێ و بەرەو کوێ بڕۆین؟

من بەبێ ئەوەی هەستی پێبکا، خوشکەکەم خستە بن چاودێرییەوە. دیاربوو ئەو خۆشییەکی زۆر لەو سواربوونە دەبینی و وێنەی هەموو شتێک و هەمووانی دەگرت. بینیم دڵشادە و ئەمەشم زۆرپێ خۆشبوو. هەروەک ئەوە وابوو، لە دیمەنێکی شادمانانەی خێزانی فیلمێکی هۆلیوددا بین.

«نەستەرەن»یش هەموو هەوڵێکی خۆی خستبووە گەڕ، کە هەر هیچ نەبێ گەرانێکی نمونەیی بۆ دایکم بسازێنێ، ئەوەشی تێپەڕاند کە من بە شۆفارێکی بەدکاری لە قەڵەم بدەم. ئەو ئاماژەی بە بورجە بەرزەکان دا و بە دووررودرێژی سەبارەت بە تەلارسازیی ڕۆنانەکەی دوا، کە کەرەستەیەکی تایبەتییان لە بیناکردنەکەوە بۆ بەکارهێناون.

خوشکەکەم، حەزی لێبوو بە کامی دڵ چێژ لە ئازادبوونەکەی ببینێ، خواخوای بوو هەموو شتێک لە بارەی دوبەیەوە بزانێ. ئەو سەبارەت بە تەنگژەی ئابووری زۆر پرسن بوو، بەوەی دواتر چۆن شارەکە بەرگەی گرت و ئەو تەلارە زەبەلاح و بڵند بڵندانەیان ڕۆناون.

نەستەرنیش بە حەوسەڵەوە پێیڕاگەیاند، ئەو قەیرانەی بەسەر وڵاتەکەدا تێپەڕی، زۆر کاریگەر بوو، بەڵام خۆ نووسینگەی گەشتیارییەکەش لێی سوودمەند بوو، چونکە هۆتێلەکان کەوتنە داشکاندنی نرخەکانیان بۆ ئەوەی گەشتیار بۆ لای خۆیان ڕابکێشن. هەروەها ئەوەشی پێراگەیاند، کە ژمارەیەکی زۆر لە کرێکاران، لە ماوەی ئەو تەنگژەیەدا، بە دەستی بەتاڵ گەڕانەوە وڵاتەکانی خۆیان.

خوشکەکەم دەیویست بزانێ، ئاخۆ ژیان لە دوبەیدا چۆنە. ئایا ئاسایشپارێزانەیە؟

نەستەرەنیش وەڵامی دایەوە، کە سەرتاسەری وڵاتەکە پڕ ئاسایشە؛ خۆ ئەگەر یەکێک ڕێسایەکی شکاند، ئەوا تەڕدەستانە لە وڵاتەکە وەدەر دەندرێ.

لەو کاتەی من گوێم دەگرت، سەیرێکی ئەو ناوەم کرد. ئاخر ئەو شوێنە هیچ بەهایەکی مێژوویی نەبوو، هەر بۆیەشە شێخەکان توانیبوویان بۆ هەموو لایەکی بیابان پەل بهاوێن. هیچی وای تێدا نەبووە کە جێگەی سەرنجان بێ، بەڵام توانییان بەو ملیار دۆلارانەی خۆیان، دوبەی مۆڵ، گەورەترین بازاڕی جیهان لەوێدا بنیات بنێن. لە یەکێک لەو مۆڵانەدا، حەوزی ماسی وایان لێدروست کردووە، تیایدا قرشەکان مەلە دەکەن.

دایکیشم کڕوبێدەنگ دانیشتبوو. منیش نەمدەتوانی ئەو مەتەڵە هەڵبێنم، ئاخۆ ئەو لەو ساتەدا لەلای خۆی بووە، یاخود خەونەکانی تەلیسمیان لێکردووە و لەگەڵ خۆیاندا فڕاندوویانە. زۆریش کەیفم بەوەهات، کە هیچی دەربارەی مەککە نەگوت، بەڵام لە هەمان کاتیشدا لەوە دەترسام، لەپڕێکەوە، هەر کاتێ گەیشتینە بیابان، ماڵی ئەڵڵا لە ئاسۆی هزرەکانی سەر هەڵبداتەوە.

جێبەکە بۆ چەندین جار، زنجیرە دووکانەکانی نیکی گوسی و ڕۆلێکس و پۆشاکی ئافرەتانی تێپەڕاند و لە دواییدا بە ملیۆنان ترومبێل و هەزاران بورجی باڵا و بە سەدان پۆستەری گەورۆنەی جۆرج کلۆنی و کیم کارداشیانی لە پشت خۆ جێهێلا. ئێمە گەیشتینە تەختایی، ئیدی دەبوایە چاوەکانمان لەسەر بەتاڵی ڕابێن. لەپڕێکیش بیابانەکە بەدەرکەت، تا چاو

حوکمی دەکرد لەگەڵ ئاسۆکەدا درێژ دەبووەوە، لەو شوێنەی ڕۆژ بە هێواشی ئاوا دەبوو.

جیبەکە زیاتر ڕۆیشت، بیابانەکە ئێمەی گەیاندەوە سەر زەمینەی واقیع، ئێمەی بردە دوبەی جاران. ئەوەش وەک ئەوە وابوو، بە تەواوی خەو تۆی بردبێتەوە. ئێستاش کە ئێمە قوللە بەرزەکانمان لە پشت خۆمان جێهێڵا، بیابان هەر بە خۆی هەموو جوانییەکەی خۆی نیشانداین. وەک ئەوە وابوو، زەریایەکی زێڕ و تەڵای کۆن لەبەردەمماندا بێ، لە بانەوەش ڕۆژە زەبەلاحەکە خەریکبوو ئاوا دەبوو. من هەستم بەخۆم کرد، وەک ئەوەی دینداریک بم، لە خوایەکەی نزیک بکەوێتەوە، کە لە هەموو ژیانیدا هەر خەونی پێوە بینیوە. هەموو شتێک وەک خۆی بێگەرد و دێرین بوو.

ئای چ خۆش بوو، کە نەستەرەن ئێمەی بۆ ئێرە هێنا. خۆ ئەگەر ئەو کات، ئەو بەتەنیا لەگەڵ من لەو بیابانە بایە، ئەوا لە نزیکییەوە دەوەستام، تا لەگەڵ ئەودا لەنێو ئەو دیمەنەدا ئاوێزان ببین. ئەوەش هیچی لەو پرسە نەدەگۆڕی، ئاخۆ شۆفارێکی بەدکار بوایە یاخود نا.

ئەنگۆرەکە خەریکبوو تارایەکی تەنکی بوولێڵ بەسەر بیابانەکەدا بدا.

خوشکەکەم کەوتبووە نێو دەریای خەیاڵەکانی خۆیەوە. دایکیشم گەڕابووەوە نێو تەونەکەی خۆی، وەک ئەوە وابوو هەردووکیان هی ئەوە نەبن دەست بیانگاتێ. دوو ژن، دوو کەسی هەرە خۆشەویست لە ژیانم، کە ئەوەندە لە نزیکم بوون، کەچی لە هەمان کاتدا ئەوەندەش دوور، کە هەر نەیاندەگەیشتمێ.

"ئەرێ ئێوە خۆ کەسانی ئاسایی نین،" هەمیشە ژنەکەم هەروای پێدەگوتم؛ "خۆ ناتوانم گفتوگۆیەکی ئاسایی لەگەڵ ئێوەدا بکەم. ئێوە باڵ دەگرن، هەمیشە لەنێو گەردوونەکەی خۆتاندا دەخولێنەوە."

لەوانەیە ئەو ڕاست بکا. هەرگیز نەمتوانیوە گفتوگۆیەکی ئاسایی لەگەڵ دایکمدا بکەم. هەرگیز نەمتوانیوە ئەوەی لێ بپرسم، ئاخۆ وەک ژنێک چۆن لەگەڵ باوکمدا ژیاوە. ئاخر خۆ بوارێکی وات بۆ نارەخسێنێ تا جۆرە پرسیارێکی وای لێبکەی. ئای چەند جاران نەمتوانیوە لێیبپرسم: *باشە دایکە، ئەرێ یەکەمین ڕۆژ و یەکەمین شەوت چۆن لەگەڵ کەسێکی تەواو نامۆ، سەرباری ئەوەش کەمئەندام بەسەربرد؟*

هەرچەندە باوکم کەمئەندام بوو، هەرچەندە لە ماڵ بە زمانی ئاماژە لەگەڵ یەک دەدواین، لێ هەموو شتێک بە شێوەیەکی ئاسایی دەڕۆیی، خەڵکانی دیکە هیچیان بە لاوە سەیر نەبوو. ئێمە بەو کەموکورتیەی نێو خێزانەکەمان شاناز بووین، ئەمەش وەنەبێ هیچ خەوشێکی هێنابێتە سەرمان، بەڵکو بەهایەکی زێدەباری دیکەشی بەخشییە ماڵباتەکەمان.

"بە هەبوونی ئەو جۆرە باوکە، ئێوە لە ژیانی خۆتاندا بەسەر زێڕدا دەکەون." دایکم هەر لە منداڵییەوە وای فێرکردبووین. خۆی هەر واش بوو، چونکە لە ڕێی ئەو باوکەدا، ئێمەی منداڵ، کەسانی بەهێز، پشتبەخۆبەستوو و ماندوونەسانمان لێدەرچوو. هەموو منداڵێکی خێزان ئەگەر دایک و باوکێکی وەک هی منیان هەبوایە، وەک دایکم بەڵێنی پێدابووین، ئەوا بەسەر گەنجینەی زێڕ و تەلادا دەکەوتن.

زنجیرەیەک زورگی لماوی لە دوورەوە دەرکەوتن: هەروەک ئەوەی وشتری زۆر زەبەلاح بن و لە بیاباندا لێیان پاڵدابێتەوە.

"باشە بەسەر ئەو زورگانەدا لێبخوڕین؟ ئامادەن بۆ ئەو بناولێدانە؟" ئەوە دەنگی شوفێرەکە بوو، وا بانگی کردین.

"نەخێر، بناولێدان نا." نەستەرەنیش بە پێکەنینەوە وا وەڵامی دایەوە.

شوفێرەکەش گوتی؛ "بەڵام خۆ بناولێدانی کورت، خراپ نییە."

منیش سەیری دایکمم کرد و بە هێواشی دەستێکم لێدا تا لە دالْغەکانی بە ئاگا بێنمەوە: "دایکە، کەمێکی دیکە شوفێرەکە بەسەر ئەو گردانە دەکەوێ، لە یەکێکەوە بۆ ئەوی دیکە بازدەدا. ئاگاداربە نەترسێی، هیچ ڕوونادا، شتێکی خۆشە گەر جارێک شتێکی وا بە چاوی خۆت ببینی."

*دەیانەوێ لێرە بتکوژن،* شتێکی وا لە مێشکم چەقی. بەلاّم خۆ دەمزانی ئەمەیان بیرۆکەیەکی بێ بایەخە. من ماندوو بووم، ئەو ڕۆژانەی دوایی، زۆر سەرقالّ بووم، باری دەروونیشم زۆر وروژاو بوو، شەوەکەشی لەنێو هوتێلەکەدا، دانیشتبووم، هەر دەمنووسی.

"هەموو ئامادەن؟" بە زەوقێکەوە نەستەرەن وا بانگی کردین، وەک ئەوەی خێزانەکەی خۆی بێ و گەشتیان پێبکا.

لێخوڕەکەش پێی لێنا، جێبەکە بە خێراییەکی شێتانە دەرپەڕی و گەیشتە لووتکەی گردەکە، لەو کاتەشدا دایکم توند باسکمی گرتبوو، خوشکیشم لەبەر حەپەساوییان دەستی لەسەر دەمی خۆی دانابوو.

نەستەرەن هاواری کرد: "ئێستاش!"

جێبەکە وەک دایناسۆرێکی کەتە، لەسەر لوتکەی گردەکەدا بازیدا، لە هەوادا تەکانێکی دا و لە دووری بیست مەترەوە بایدایە سەر گردۆلْکەیەک.

دایکم هاواری کرد: "ئای خوای گەورە!"

خوشکەشم بانگی کرد: "باوەڕ ناکرێ!"

نەستەرەنیش پێکەنی، منیش بڕوام بەوە هێنا، ئەو پێکەنینە هی کەسێکی شۆفار نییە، بەلْکو هی ژنێکی گەنجە، لەو کورتە گەشتەماندا خۆشی دەبینێ.

شوفێرەکە هەندێکی دیکە بەنێو بیابانەکەدا ڕۆیشت، تا لە دوورەوە ڕیزە ڕوناکاییێکی کز بەدەرکەوتن.

"ئەوێ کاروانسەرایە، لەوێ پشوویێک دەدەین و پاروە نانێکیش دەخۆین. ئەوێ بۆ دایکت زۆر خۆش دەبێ." نەستەرەن وای بە من گوت.

منیش لەبیرم چوبوو ئەمە بڵێم. لەنێو جێبەکدا قردێلەکەی لە پرچی کردبووەوە، ئیدی قژی لەسەر کورسی پاڵدانەوەکە، لەو لایەی من لەپشتەوەی دانیشتبووم، شۆڕ ببووەوە. قژەکەی ڕەشێکی قەترانی بوو، پێموابوو ئەگەر بچێتە نێو لمەکە و لێی ڕابکشێ، ئەوا چاوی مرۆ سەرەتا هەر پرچەکەی دەبینی، پاشان باقی جەستەکەی.

نەستەرەنی ڕێنوێنمان پێیگوتین، ئەم شوێنە یەکەمین کاروانسەرا بووە کە لە لایەن ئێرانییەکانەوە دروستکراوە، ئەوەش مێژووەکەی بۆ سەردەمی ئەخمینییەکان دەگەڕایەوە. "ئەوان دەیانویست شوێنێکی ئارام و سەلامەت بۆ مانەوەی شەوانی بازرگانە ڕێبوارەکان دروست بکەن، ئەوانەی بەسەر ئەو ڕێگەیەدا دەڕۆیشتن و ڕێگەکەش بەڕێی شاهانەی ئەخمینییەکان ناودار بوو. ڕێگەیەکی کۆنینەیە، ۲۵۰۰ کیلۆمەترێک دەبێ."

«نەستەرەن» ئیشەکەی خۆی بە جوانی ڕایی دەکرد، بەڵام من بە دیوێکی دیکەدا وام دەبینی، کە کارەکە بۆ ئەو گونجاو نییە، ئاخر ئەو ئەوەندە گەنج و ناسک بوو، بۆ ئەو چیرۆکە کۆنانە نەدەشیا.

«نەستەرەن» وەها لەسەر قسەکەی خۆی ڕۆیشت؛ "گەورە مێژوونوسی گریک، «هیرۆدۆتس»، لە کتێبە گەشتنامەکەی خۆییدا بە ڕوونی نووسیویەتی، دەق قسەکەی ئەو دەهێنمەوە: "بە درێژایی ئەو هێڵە زەردەی

بیابان و ئەو ڕێگە تەلیسماویە، بە سەدان کاروانسەرای شاهانە هەن. هەمووشیان سەلامەتن و شوێنی لەباری بە یەککەشتنی خەڵکن."

کاروانسەرایەک کە مێژوویێکی بارزگانانەی سەردەمی ڕابردووی هەبێ، لە هیچ شوێنێکدا نایدۆزیتەوە، بەڵام من وام دانا: کێ دەزانێ. خۆ ئێمە لە بیاباندایین و دەکرێ بەدوەکان (ڕەوەندەکان)، عەرەبە نیشتەجێیەکانی پێشووی بیابان، هەمیشە هەر بەسەر پشتی وشترەکانیان بێن و بڕۆن و شەوانیش لە کاروانسەراکاندا پشوو بدەن. سەردەمی خۆی حاجییەکان بە کاروان و بە وشترەوە بەنێو بیاباندا بەرەو مەککە دەڕۆیشتن. ئەوان هەموو ڕۆژەکەی هەر دەڕۆیشتن و بیابانیان تەی دەکرد و بە شەویش لە کاروانسەرادا دەمانەوە.

دایکم کە تا ئێستا بە ئارامی لە شوێنی خۆی دانیشتبوو، هەر سەیری ئەو ناوەی دەکرد، لە پڕێکەوە کەوتە قسە: "پێغەمبەر محەمەد، هەمیشە بە سواری وشتر سەفەری خۆی دەکرد و لە کاروانسەراشدا لای دەدا."

نەستەرەنیش پێیگوت؛ "ئۆو، چەند خۆشبوو وات گوت، هەڵبەتە هەر وابووە."

دایکم لەپڕ بە شتێکی دیکەشیی سەرسام کردین: "لەو کاروانسەرایانەدا ئەو لەگەڵ ڕێبوارەکانی دیکەدا دەقە نووسراوی پێغەمبەرەکانی پێشووتری تاوتوێ دەکرد."

بەو بەها زانستییە دیرۆکییانە گەیشتینە کاروانسەراکە. لەوێدا دەنگی ئاوازی موزیکێکی خۆش و بە زەوقی عەرەبی بەرەو ڕوومان هات.

منیش پەرۆشبووم ئاخۆ چیمان ڕووبەڕوو دەبێتەوە.

## ١٨

# لە کاروانسەراکەدا

خۆ ئێمە هەر بە تەنیا نەبووین لەوێ، نزیکەی بیست جێبی دیکەم بینین لەبەردەم کاروانسەراکە ڕاگیرابوون. پێموابوو، دایکم زۆر کەیفی پێدێ. بۆ منیش هەر خۆش بوو، هەر هیچ نەبێ، هەندێ لە کۆمپیوتەر، ئەنتەرنێت و ئیمێل و هەروەها لەو هەواڵە بێکۆتاییانەی دەربارەی «ترەمپ» هەن، دوور بکەومەوە، ئاخر هەر هەفتەی پێشتر بوو، ترەمپ بە فەرمی وەک چل و پێنجەمین سەرۆکی ئەمریکا، چووە نێو کۆشکی سپییەوە.

بە یارمەتی نەستەرەن دایکم لە جێبەکە دابەزاند. زەحمەتیش بوو لەنێو لمدا بڕۆین، تا چۆکان دەکەوتییە نێو لمەکە.

دیسان خوشکەکەم گەڕابووەوە نێو جیهانەکەی خۆی. ئەوم چیدی نەبینیەوە، پێموابوو بەوە خەریکبوو، لەگەڵ ژینگەکە ئاشنا بێ. ئیدی پیلی دایکمم توند گرت و بە دوای نەستەرەندا وەژوور کاروانسەراکە کەوتین.

تا دەهاتیش ئاوازی مۆسیقا عەرەبییەکە بەرزتر دەبووەوە، بۆ مایەی سەرسامیم، لە پڕێکدا بەسەر جیهانەکەی عەلائەدین و فانۆسە تەلیسماوییەکەیدا کەوتین.

وەنەبێ ئەوێ کاروانسەرایەکی ڕاستەقینەبێ، بەڵکو چادرێکی سیرک، کە بە گڵۆپی ڕەنگین ڕازابوو، چەرخوفەلەک و دیواری مقەبا[23]کە زۆر

---

[23] مقەبا: کارتۆن.

زڕەعەرەب[24] بەوێدا دەڕۆیشتن. ئەوانەی بیرۆکەی نۆژەنکردنەوەی ئەو کاروانسەرایەیان داهێناوە، جیهانێکیان دروستکردووە بە جوانی لەگەڵ دوبەی و حەوزە ماسییە پانوپۆڕەکەی مۆڵەکە دەهاتەوە.

هەموو بۆشایی نێو کاروانسەراکە بۆنی بۆیەی پلاستیکی لێوەدەهات کە لە کونە کەپووم چەقیبوو.

بە سروشتی خۆم، ڕقم لەو شوێنە ساختەکراوە گەشیارییانە دەبێتەوە، بەڵام خۆ لەگەڵ دەروونی خۆم وەها ڕێککەوتبووم، لەم گەشتەمدا چێژ لە هەموو شتێک وەربگرم. لەڕاستیشدا خۆ شتەکەش لەبەر خاتری من نەبوو، بەڵکو لەبەر خاتری دایک و خوشکەکەم بوو. ئیدی خۆم ڕاستکردەوە و لە کاروانسەراکە وەژوور کەوتم. من نووسەر بووم، لەگەڵ ئەندێشەدا کارم دەکرد و ڕۆمانم دەنووسین. دوبەیش خۆی ڕۆمانێک بوو. ئەو کەسانەش کە ئەو کاروانسەرایەیان لە بیاباندا دروستکردبوو، لەڕاستیدا دنیایەکی دەستکردییان ئافراندبوو، چیرۆکێک هەر دەبێ بە باشترین شێوە سەرنجڕاکێش بێ. منیش دەبوایە شتێک بدۆزمەوە، تا بە هۆیەوە بەم دنیا مرۆڤکردەدا سەرسام بم. ئینجا خۆم دایە دەست قەدەر، لەگەڵ دایک و خوشکم، هەڵبەتە لەگەڵ نەستەرەنیشدا چووینە نێو جیهانی کاروانسەراکە.

لەنێو ئەو گەشتیارە زۆرانەی ئەوێدا، ئاڵمان، هۆڵەندی و بەلجیکیش هەبوون.

---

[24] نووسەر وشەی nep-Arabischی بەکار هێناوە، دەقاودەق واتای عەرەبی ساختە، واتای ئەوانەی عەرەبی ڕاستەقینە نین دەدا، منیش وشەی زڕم لێرەدا بە دروست زانی. و.

لەوێ لەنێو لمدا، سەکۆیەکی گەورۆنە بنیادنرابوو، لە چواردەوریشی ڕایەخی لێداندرابوو، پڕی سەری دۆشەک و سەرین بوون، بۆ ئەوەی تۆ وەک سوڵتانێک بەدەم نێرگلە کێشانەوە چێژ لە سەمای سمت بادان وەربگری.

نەستەرەنیش تایبەت بە ئێمە شوێنێکی سێ کەسی لای سەکۆکە بۆ گرتبووین. پێشخزمەتەکان بە خۆیان و جلوبەرگی نەریتییانەی خەڵکی بیابان دەهاتن و دەچوون، چایە و نێرگلەیان بۆ مێوانەکان دادەنا. بۆن و بەرامەی کەبابیش بەرەو ئاسمانە ساماڵ و شینەکەی سەر بیابان هەڵدەکشا.

ئێمە لە شوێنی خۆمان دانیشتین و چا و خورمایان بۆ هێناین. زۆی پێنەچوو، ژەمە خواردنێکی گەرمیشیان داینێ، پاشان سەماکەرە سمت بادەرەکان هاتن و نمایشی خۆیان کرد.

لەو نێوەدا ئافرەت بە خۆی و نیقابەکەیەوە دەسووڕایەوە، تەنانەت کونی چاویشیان بە دەرەوە نەبوو، نەتدەتوانی بیانبینی. ئەوان یەکە و دێمکەیەکی ئاو و تاسێکیان بە دەستەوە بوو، بە لای هەمووواندا دەهاتن، تا بەر لە خواردن دەستەکانیان بشۆن. پاشان پێشخزمەتان نانی شێوانیان لەسەر مەجمەیەکی[25] زیوین دەگێڕا.

گەشتیاران لە خۆشیاندا دەگەشانەوە، ئاخر خۆ ئەوە خوانێکی ئاسایی نەبوو، بەڵکو شەقڵی ژیانێکی دیکە بوو، هەروەک ئەوە وابوو، لەنێو حەکایەتە کۆنە عەرەبییەکاندا بژێی. دوای نان و دوای هێنانی شیرینی، سێ ئافرەتی زگ ڕوت و پێ پەتی هاتن و هەر یەکەشیان نیقابێکیان بەسەر

[25] مەجمە: سینی، خوان، سفرە.

دەموچاودا دادابوو، چوونە سەر سەکۆیەکە. تا دەهاتیش موزیکەکە توندتر دەبوو، ئیدی کچە سەماکەرەکان کەوتنەبادان، سینگ و مەمکیان بادەدا، سمتیان بادەدا، ڕانیان دەهێنا و دەبرد. سوڵتانەکانی سەدەکانی ناوەڕاست هەر بەم بەزم و ڕەزمەیان بردۆتەسەر. باشە تۆ بڵێی ئەو ژنانە چۆن بتوانن بەم جۆرە ئەندامانی جەستەی خۆیان سووک و تەڕدەستانە بابدەن و بجووڵێنن؟ ئێمە خۆمان سەر بە خانەوادەیەکی دینداریین، گوێمان لە سەماکەری سمت بادەر ببوو، بەڵام ئەمەی بینیمان، ئێمەی بەشەرمدا هێنا. هەرچی دەربارەی من بوو، تام و خۆشییێکی شەرمنانە بوو، لەبەر خوشکەکەشم نەدەکرا زیاتر سەیری ئەو ژنانە بکەم. بۆیە هەڵستام، بەڵکو بە دەوری چادرەکان و بەنێو جیهانە ئەفسووناوییەکەی عەلی بابادا قەدەمێک لێبدەم.

ئەو سەماکەرانە بە خۆیان و لاقە درێژ و سپی و سۆڵ و جوانەکانیان و بەزگ و سمتیان، بە دڵنیاییەوە عەرەب نەبوون، من گومانم بۆ ئەوە چوو، ئافرەتی ڕووسی بن. هەموو ئەو کچانەی نیقابپۆشیش بوون، هەر نابێ هی میرنشینەکە بن. ئاخر خۆ ئاکنجییەکانی «دوبەی» لە هیچ شوێنێک نەدەبینران، ئەوان هەموویان لە دەرەوەی شارە جەنجاڵەکان، لەگەڕەکە کەشخەکانیان لەنێو کۆشکە شاهانە خانەوادەییەکانیاندا دەژیان.

من لە چادرێکەوە بەرەو ئەوی دەڕۆیشتم، تا تووشی نەستەرەن بوم. ئەویش لە لای کچێکی پێشخزمەتی نیقابپۆشدا وەستابوو، قسەی دەکرد، بە زمانی عەرەبیش نەدەدوا بەڵکو بە فارسی. لەپڕێکدا کچەکان نیقابەکەیان هەڵدایەوە؛ ئۆو، خۆ ئەوان کیژۆڵەی ئێرانی بوون.

کەمێکی دیکە ڕۆیشتم، بینیم نمایشی سەماکەرە سمتبادەرەکان بەسەرچوو. هەر سێ ئافرەتەکان لەسەر سەکۆکە دابەزین ڕوویان لەو چادرە کرد، کە پیاوێکی ڕیشدار لەبن دژداشەیەکی سپییەوە چاوەڕێی دەکردن. پشت و

زگیان لەبەر ئارەقە تەڕتەڕ ببوو. هەر یەکسەر لەنێو چادرەکەدا، نیقاب و تاسەی سەریان فڕێدا. هەر بە ڕاستیش ئەوان ئافرەتی ڕووسی و پۆلۆنی کەژەی مووزەرد بوون.

لەنێو ئەو پیاوە ڕیشدارانە، کە هەموویان دژداشەی سپییان لەبەردابوو، بێگومان یەک دوو بەدکارییان هەر لەنێودا بوو، ئەوانەی بۆ ڕژێمی ئێران کاریان دەکرد و بۆ ئەوە ڕاسپێردراون، کە کەسانی بەرهەڵستکاری ڕژێم فت بکەن. خۆ ئەگەر پێویست بێ، ئەوا دەیانتوانی ئەوەی مەبەستیان بێ، هەر لەبیابانەکەدا ساردی بکەنەوە، و بیخەنە ژێر لمەوە.

کاتێکیش گەڕامەوە لای سەکۆیەکە، بینیم دایکم بە تەنیا لەوێ دانیشتووە. خوشکم لە هیچ شوێنێک دیارنەبوو. منیش نیگەران بووم، دەترسام شتێکی گەوجانە بکا یاخود سەرگەردان و ون ببێ.

من لەوێ وەستام، بە هیوای ئەوەی لەپڕ دەرکەوێتەوە، بەڵام خۆ سەروسۆراغی دیار نەبوو. چوومە دەرەوە و لەوێ بەنێو تاریکایدا غارم دا، وەک شێتێک بانگم دەکرد: "مەحبوووووب! مەحبوووووب!"

کاتێکیش هیچ وەڵام نەبوو، دیسان چوومەوە نێو کاروانسەراکە. ئەوسا لە هیکەوە ئەوم لەنێو چادری سەماکەرە سمتبادەرەکان بینی. لەوێ لەگەڵ سەماکەرەکان وەستابوو، قسەی لەگەڵ دەکردن. ئەرێ بۆ خاتری خوا، تۆ بڵێی باسی چییان کردبێ؟ منیش لەوێ لەبەر تاریکی وەستام و سەیرم کردن.

نانی شێوان تەواوبوو، گەشتیارەکان هەڵسان و خۆیان بۆ تێشی[26] دادێی چالاکییەکانیان، بۆ گەڕانێکی دیکەی نێو بیابان ئامادە دەکرد. دایکیشم هێشتا هەر لە هەمان جێگەی خۆیدا دانیشتبوو، کەوتبووە نێو دەریای بیرکردنەوەی خۆیەوە.

لەبیرم دێ، کاتی خۆی لە ماڵ جاروبار نێرگلەیەکی دەکێشا. منیش یەکێکم بۆ بەڕادان دا بەخۆشم حەزم چووە جگەرەیەک، هەرچەندە لە باری ئاسایدا نەمدەکێشا. سەیری دەوروبەری خۆم کرد، بەڵکو یەکێک ببینم و داوای جگەرەیەکی لێبکەم، ئاخر خۆ من لە نێو کاروانسەراکەدا بووم، داوایەکەش لەگەڵ کلتوورەکەدا دەهاتەوە.

ئەو کابرا بەڕدێنە زرعەرەبە، کە من پێموابوو مەزنی کاروانسەراکەیە، بەخۆی و جگەرەکەی لێو قامکەکانی لەو ناوە دەسووڕایەوە. هەروەک ئەوەی بزانێ منیش دانە جگەرەیەکم دەوێ. لەو تاریکییەدا هاتە لام وەستا، جگەرەیەکی پێشکەش کردم و ئاگریشی پێدام.

لەبەر تیشکی چەرخەکەدا، سەیری دوو چاوەکانی یەکدیمان کرد. هیچ گومان لە ئارادا نەما، ئێمە لەیەکدییەوە زانیمان، کە هەر یەکەمان کێیە؛ ئاخۆ ئەو لەوێدا چی دەکرد و منیش بۆچی ڕێم کەوتۆتە بیابانەکە. ساتێکی بێدەنگی باڵی بەسەردا کێشاین. شۆڕشی ئێرانی ئێمەی بەو ڕۆژە گەیاند. من یەکێک بووم لە ملیۆنان پەنابەری هەڵاتوو، ئەویش یەکێک بوو لەو هەزاران کەسەی کە ئێشکگری مەلا ڕۆحانیەکان بوون.

---

[26] تێشی، نورە، گێم، شوط

لە دوورەوەش لە بەر تاریکییەکەدا، ڕیزە وشترێک یخ درابوون. لەپڕێکەوە ملی خۆیان درێژ کرد و بۆڕاندنیان.[27]

من لە کابرام پرسی: "ئەرێ بۆچی وادەکەن؟"

"ئەوان بە پەڕجووەکە سەرسامن." پیاوەکە وای وەڵام دامەوە و ئاماژەشی بۆ ئاسمان کرد. دیسان ڕێگەی کاکێشان وەک پەڕجوییێک لە بانی بیابانەکەوە دیاربوو.

منیش بە سەرسامییەوە گوتم: "وای، چەند جوانە، تۆ مەبەستت ئەوەیە؟"

- "بەڵێ، نەخێر، بەڵام ئەوان ئەگەر من ببینن، دەبۆڕێنن. پێیانوایە دەبێ هەڵبستنەوە."
- "بۆچی هەڵبستنەوە؟"
- "بۆ کاروانەکەی خۆیان. ئێمە کارێکی وادەکەین، گەشتیارەکانمان خۆشیی لە گەشتەکەی خۆیان ببینن. ئەو دەرفەتەیان دەدەینێ خۆیان سواری وشترەکان ببن و بیانهاژۆن. ئێمە دەیانگەڕێنینەوە سەردەمی بەرێ، دەیانگەڕێنینەوە بۆ سەدەکانی ناوەڕاست."
- "باشە ئێوە ئەو کارە چۆن دەکەن؟ هەر تەنیا سواربوونی وشتر و کەمێک گەڕان و سوڕان؟"
- "سەیرکە، هەموو کەرەستەکانی ئەو گەشتە، هەروەک هی سەدەکانی ناوەڕاست، شتی ماک و ڕاستەقینەن. ڕێگەی کاکێشان دێرینە، بیابانەکە کۆنە، وشترەکان هەروەک ئەو وشترانەی سەردەمی بەرێ وان، شەو شەوگاریش لەوەتەی هەیە کۆنینەیە. ئاخر گەشتی سروشتیترت لەوە

---

[27] لەبەرئەوەی دەقاودەق نەمزانی دەنگی وشتر چی پێدەڵێن، بۆیە هەر بۆڕاندنم بەکارهێنا. و.

دەست ناکەوێ. خۆ ئەگەر مەعمیلەکانمان یەکجار گەشتێکی وەهامان لەگەڵ بکەن، ئەوا هەرگیز لەبیری ناکەن."

- "ئێوە کاروان بەنێو بیاباندا دەبەن."
- "ئێمە هیچ داناهێنین، ئێمە ڕێکیدەخەین. ئێمە کاروانێک لەبن ئەو ڕێگە کاکێشانە سەیروسەمەرەیەدا بەڕێ دەخەین، بۆ سەردەمی سوڵتانە ڕەسەنەکان و حەکایەتە دێرینەکانیان دەئاژۆین."

بە دەم جگەرەکێشانەوە بە بێدەنگی لەتەنیشت یەک وەستاین.

کەمێک دواتر، هەر دوازدە کچە زرعەرەبە نیقابپۆشەکان لە چادرەکە هاتنەدەر. ئەوان بەو تاریکییە بەرەو لای وشترەکان ڕۆیشتن، هەر یەکە و ڕێشمەی وشترێکی بە دەستەوەگرت. کۆمەڵە گەشتیارێکیش لە دەروازەی کاروانسەراکە چاوەڕێیان دەکردن.

هەر کیژێک بە خۆی و هەوساری وشترێکەوە چووە بەردەم گەشتیارێک و وشترەکەی لەبەردەمدا یخ دا و یارمەتیشی دا تا بچێتە سەر زینی وشترەکە سواربێ. کاتێکیش هەمووان سوار بوون، کچەکان وشترەکانیان بەدوای یەکدا ڕاکێشا، تا کاروانێک دروست بکەن. بەم جۆرە گەشتیارەکان گەشتەکەی خۆیان لە بن ڕێگەی کاکێشان و بەنێو بیاباندا کرد، کە بەبێ دوودڵی بیابانەکە بەرەو مەککە دەڕۆیشت.

کاتێک ئەوان ڕۆیشتن، دنیا کش و مات بوو.

منیش سەیری کاروانەکەم کرد، لەنێو تاریکایەکەدا، بەرەبەرە لەبەر حوکمی چاوان ئاوادەبوون و نەدەمان. بیرم لێکردەوە، ئای چ دنیایەکە. هەر بەڕاستی ئەمەیان زۆر جیاوازە لەوەی ئێمە ڕۆژانە دەیکەن. من ڕۆژانە لەپشت مێزی کۆمپیوتەر، لە ژووری کارکردنەکەم بەبێ کیژی سمتبادەری

ڕووسی و بەبێ کچی نیقابپۆش دادەنیشم. بەڵام ئێستا دەرکم بەوە کرد، کە لەڕاستیدا منیش هەروەک ئەوانم کرد.

من لە گڵ هزران ڕاچووبووم، تا ئەو کاتەی بێ ئەوەی هەست پێبکەم، دایکم هات و لە تەنیشتم وەستا. بەیەکەوە سەیری ئەو شەوە پەڕجووئاسایەمان دەکرد. لەپڕێکدا و لەنێو تاریکاییەکەدا وشترێک بۆڕاندی. ئاشکرا دیاربوو بۆڕاندنەکە بۆ ئێمەیە.

ڕێگەی کاکێشان، بیابانەکە، وشترێک و دایکم.

من هیچم نەهۆنییەوە، بەڵام دوودڵ بووم لەوەی لەڕاستیدا هەر دەبوا ئەمەیان ببێتە بەندێک لەو ڕۆمانەی پێیەوە سەرقاڵ بووم.

## ١٩

# گفتوگۆیەکی چاوەڕواننەکراو

**ئەنگۆرەیەکی** درەنگ بوو، گەشتیارانیش وردە وردە بەرەو شارەکە دەگەڕانەوە، بەڵام هێشتا دایکم نەیدەویست لەوێ بڕوا. کەوشەکانی داکەندبوون، بەنێو لمەکەدا، کە هێشتا هەر گەرم بوو، دەڕۆیشت.

منیش لێیگەڕام بڕوا، بەڵام بێ ئەوەی سەرنج بدا، لە دوورەوە چاوم لێی بوو. ئاخر ئەگەر وەها نەبوایایە، لەوانەبوو هەر نەگەڕێتەوە. ئەو ئەوەندە ڕۆیشت، لە حوکمی چاو چووە دەر. نەستەرەنیش بە دوایدا غاری دا تا یارمەتی بدات.

منیش بە دوای خوشکەکەمدا گەڕام، تا پێی بڵێم، جێبەکە ئامادەیە بمانگەڕێنێتەوە شارەکە. ئەو لەسەر مافوورێکی گوڵگوڵی دانیشتبوو، لەگەڵ ژنێکی هۆڵەندیدا دەدوا. لەوانەیە ئەمەش هەر بەهۆی منەوە بووبێ، ئاخر پێشتر لەنێو ئاپۆرای خەڵکەکەدا ئاماژەیەکم بۆ کردبوو، پێمگوتبوو: "ئەم ژنە هۆڵەندییە."

- "ئاخر چۆن دەزانی؟"
- "هەروا، لەڕەفتارەکەیدا دەزانم."
- "کێ ناڵێ ئەو ژنە ئاڵمان نییە."
- "ئاخر گوێم لێبوو بە هۆڵەندی قسەی دەکرد. سەربارەی ئەوەش ئاڵمانەکان خۆ بەدوورگرن."

هەنووکە خوشکەکەم لەگەڵ ئافرەتە هۆڵەندییەکە دانیشتووە و قسە دەکا، کە پێشتر منی لەگەڵ دایک و خوشکەکەم بینی بوو، منی ناسییەوە. کاتێ کەمێکی دیکە پیاسەم کرد، خەندەیەکی بۆ کردم و منیش سەرێکم بۆ لەقاند.

ئێستا خوشکەکەم لەگەڵ ئەو ئافرەتە وەستاوە و قسەی لەگەڵ دەکا. بەڵام لەبارەی چی؟ لەوانەیە ئەو ژنە هەندێ پرسیاری سەبارەت بە من و کارەکەم لێبکا، چونکە تا ئێستا ئەو قسەی لەگەڵ مندا نەکردووە. بەدەر لە یەکەمین ڕەشنووسم بە فارسی، ئەو دەستنووسەی ئەوی گەیاندە کونجی زیندان، هیچی منی نەخوێندۆتەوە. منیش پێم نامۆ بوو، لەو چەند ڕۆژانەی ڕابردوودا، هیچ وشەیەکمان سەبارەت بە کتێبەکانم، بەو نووسینانەی لەوەتەی من لە نیشتمان هەڵاتووم و بە هۆڵەندی نووسیومن، لەگەڵیدا باس نەکردووە.

زمانە نوێیەکە گۆڕانکارییێکی مەزنی بەسەر ژیانی مندا هێنا. من تازە وتارێکم لە نیویۆرک تایمز خوێندبووەوە، سەبارەت بەوەی ئاخۆ چی دەقەومێ، کاتێ نووسەرێک بە زمانێکی دیکە دەنووسێ. ئەو جۆرە نووسەرە شیرازەی لەیەک دەترازێ و پاشان ژیانی خۆی بە ڕوخسارێکی دیکە بنیاد دەنێتەوە، بە جۆرێک هیچ تاکە بەردێکی ڕابردووی بە بێ دەستکاری بەسەردا تێناپەڕێ. ئەوەش بابەتێکی باشە کە لەگەڵ خوشکەکەمدا باسی بکەم. من دەمویست دەربارەی ئەو گۆڕانکارییانە و هەموو ئەو بەردانەی ڕابردووی خۆمان بدوێم، کە جارێکی دیکە لەسەریەکم دانانەوە.

بەهۆی زمانی هۆڵەندییەوە هەموو شتێک لە ژیانمدا گۆڕا، بەڵام دوو بونەوەر، دوو ڕوخساری خۆشەویست هەرگیز نەگۆڕان؛ ئەوانیش ڕوخساری «جەواد»و هی خوشکەکەم بوون. لەبارەی ئەوەشەوە، حەزم لێبوو لەگەڵی بدوێم، بەڵام خۆ ئەوە پاوانێکی قەدەغەکراوبوو. مەودا و کایەیەک بوو، بە دڵنیاییەوە نەدەبوایە بۆی بچین، دەنا دیسان دەگیرایەوە و دەخرایەوە زیندان. دەی هیچ قسەیەکی لەبارەی کتێبەکان و چیرۆکەکانی پێمەڵێ، هەروەها هیچ وشەیەکیشی سەبارەت بە ڕابردوو لەگەڵدا باس

مەکە. دەی، لێی گەڕێ با چێژ لەو کورتە مانەوەی دوبەی ببینێ، دیاربوو من لە نەستەوە بڕیارم لەسەردابوو.

بینیم خوشکەکەم بە دەستەکانی ڕۆندکەکانی دەسڕێتەوە. لەوانەیە ژنە هۆڵەندییەکە پێی گوتبێ، کەوا من لەنێو کتێبەکانمدا، لەبارەی ئەوەوە نووسیومە. یان لەبارەی کتێبێکی دیکەوە باسی بۆ کردبێ، ئەو کتێبەی لەبارەی مەرگی جەوادەوە نووسراوە. ئەوکات خوشکەکەم لە زینداندا بوو. ئاگای لێنەبوو کەوا جەواد لەسێدارە دراوە. خۆم و مامم بە ترۆمبێلێکەوە بە تاریکایی، بەنێو چیاکاندا هەڵدەکشاین، بە دوای شوێن گۆڕێکی جەوادا دەگەڕاین، کە لە پشتی ترۆمبێلەکەدا درێژ کرابوو.

"مەحبوب، ئێمە دەڕۆین، تۆش نایەی؟" وام بانگ کرد و ئاماژەشم بە جێبەکە دا کە لە دەرەوە لە چاوەڕوانیماندا وەستابوو.

نەستەرەن یارمەتی دایکمی دا و لەسەر کورسییەکەی خۆی دانیشاند و پەتۆیەکشی بەسەر قاچەکانیدا دا، چونکە پێیەکانی لەو بیابانەدا سارد ببوون. منیش لە دوورەوە سەیرم دەکرد. لەنێو کتێبەکەمدا دەرفەتێک دەڕەخسێنم تا باوەشی پێداکەم و سوپاسی ئەو ئەرک و ماندووبونەی بکەم کە لەگەڵ دایکمدا کێشای.

ئینجا لە تەنیشت دایکم دانیشتم و لە تاریکیەکەدا چاوەڕێمان کرد تا خوشکەکەم دەگات، بەڵام خۆ زیاتری لەوەی چاوەڕوان دەکرا پێچوو. هەر دوو جێبی گەشتیاریش مابوونەوە، یەکێکیان هینەکەی ئێمە بوو، ئەوی دیکەشیان هی ژنە هۆڵەندی و یاوەرەکانی بوو.

له کۆتاییدا به خێرایی خوشکەکەم هات و خۆی بەناو جێبەکەدا کرد. چووە دیوەکەی دیکەی دایکم و دانیشت. لێخوڕەکەش سویچەکەی تێبادا و بەو شەوە بیابانمان بەجێهێشت و گەڕاینەوە شارەکە.

هەمووان کڕوبێدەنگ بوون. لەپڕێکدا دایکم لەو تاریکییەی ناو ترومبێلەکەدا سەری بۆ لای من هێنا و لە بن گوێمدا چرپاندی: "ئێمە خەریکە دەگەین."

گوێم لێبوو، هەستم کرد، لە جیهانە هەژاوە ئەندێشاوەکەی خۆیدا قسەم لەگەڵدا دەکا. ئاخر ئەو ڕۆژێکی زۆر سەرنجڕاکێشی بەسەربردبوو، ئێستا گەڕاوەتەوە نێو قووڵایی ناخی خۆی.

بەڵام خەریکە بگەینە کوێ؟

بە ترسێکەوە هەستم کرد کەوتوومەتە لەرزە، دەترسام نەبادا ئەو گەیشتبێتە ترۆپکی کاروانی حەجی خۆی، لەوانەشە لەنێو قووڵایی یان تەنکاوی جیهانە فەرامۆشییەکەی خۆیدا لێم بڕوانێ.

٢٠

## چوارەمین ڕەهەند

لە هوتێلەکەدا، چوومە پشت مێزی کۆمپیوتەرەکەم، بەڵکو یەک دوو تێبینی و سەرنج یاداشت بکەم.

خوشکەکەم دایکمی گەیاندە ژووری نووستن، یارمەتی دا تا هەندێک بەخۆی دێتەوە. لێ هەر کەمێک دواتر، دایکم هاتە لام و دانیشت. پرسیاری لێکردم، ئاخۆ ژنەکەم چۆتە کوێ، منیش بۆ چەندین جار پێمگوتەوە، کە سەری خێزانی کوڕە برایەکەی داوە.

"ئۆو، تازە زانیم مەبەستت کامە خێزانە." ئەو وا لەسەر قسەکەی خۆی ڕۆیشت؛ "جارەکەی دیکەش، کە من هاتمە لاتان، بۆ سەرخوانێکی خۆیان بانگهێشتیان کردین. خەڵکی زۆر باشن."

منیش ویستم بڵێم: "دایە، ئێمە لە «دوبەی»ن، نەوەک لە ئەمستردام." بەڵام واشم نەکرد، دەستم لە نووسینەکەم هەڵگرت و لێگەڕام دایکم زیاتر بدوێ.

ئاخر هەرگیز وەها لەنزیکەوە پیریم نەبینیبوو. دایکم لەنێو بۆشاییەکی سێ ڕەهەندیدا دەژیا. ئەو لەیەک کاتدا لە دوبەی، لە ئەمستردام و لەڕێگەی مەککەشدا بوو. بەڵام هەنووکە، بە شێوەیەکی چاوەڕواننەکراو هەنگاوێکی دیکەی زیاتر هاوێشت و چووە سەر سەکۆی ڕەهەندی چوارەمینیشەوە. ئەو شتێکی دەربارەی باوکم بۆ باسکردم و بووە مایەی حەپەسانیشم یەکسەر بایدایەوە سەر زمانی ئاماژە، بەو زمانەوە کەوتە دوان.

منیش کەوتمە بارێکی شێواو، حەیران مام، چونکە پێموابوو ئەو لەگەڵ مندا دەدوێ. بەڵام کاتێ تێگەیشتم. من پیرببووم، ئەوەندە پیر، ئێستا ئەو باوکمی لەجێی مندا دەبینی. خۆ ئەمن ئەو کەسە نەبووم کە لەبەرانبەری دانیشتبووم، بەڵکو ئەوە باوکم بوو، ئەویش بۆ ئەو دەربارەی من قسەی بۆ دەکرد. دایکم بە ئاماژەوە: *کوڕەکەمان کاروبارەکانی ڕێکخستووە. منیش بەڕێوەم. خەریکە بیابانەکەش دەبڕم، هەر بینا گەیشتمێ.*

منیش خۆم ڕاستکردەوە، وەک ئەوەی باوکم بم و بە ئاماژەوە پێمگوتەوە: *خۆ تۆ نابێ ڕۆڵەکەمان* بخەیتە ژێر گوشار *تا لەگەڵ خۆی* بتباتە *ماڵە پیرۆزەکە.*

*نەخێر، نەخێر، هەڵبەتە من واناکەم.* هەر بە ئاماژەوە درێژەی پێدا: *ئەو بە خۆی کارەکەی ڕێکخستووە. ئێمە تازە لە کاروانسەراکە بووین.*

گوێم لە دەنگی ئەسانسێرەکە بوو، بەرەو سەرەوە دەهات. لە دەرکە درا. خوشکەکەم چوو دەرکە بکاتەوە. ژنەکەم بە کەیفەوە هاتە ژوورو بانگی کرد: "ئەرێ چۆن بوو؟ ئەرێ لەوێ بەیەکەوە کاتێکی خۆشتان بەسەربرد؟"

خوشکەکەشم وەڵامی دایەوە: "زۆر خۆش بوو، زۆر تایبەت بوو."

ژنەکەم هاتە لای ئێمە، ماچێکی لە ڕوومەتی دایکم کرد و گوتی: "ئای چەند خۆشە؟ وای چەند باشە؟" پاشان ڕووی لە من کرد: "چییە، گریاوی؟"

"نا، نەخێر، نەگریاوم." وام گوت و بە دەستیشم فرمێسکەکانم سڕین.

ئینجا گوتی؛ "برازاکەم و ژنەکەی ئێوەیان بۆ نانی شێوان بانگهێشت کردووە. بەیانی، بۆ ئەنگۆرەکەی لای ئەوان دەبین."

٢١

# له هۆڵی بەرچاییکردنی بەیانیدا

**یەکێ** لە خۆشترین ساتەکانی مانەوەمان لە هۆتێلەکەدا، کاتی بەرچایی بەیانیان بوو. ئاخر خوان خوانێکی کراوە بوو. هەموو شتێکی لەسەر داندرابوو. بەڵام خۆشترین شت ئەوە بوو، ڕێبوار و مێوانانی هوتێلەکە، قاوەڵتییەکەیان بەیەکەوە دەخوارد.

بە ئاستەم مێوانی ڕۆژئاوایت لەوێدا دەبینی. زۆرینەیان خەڵکی وڵاتە دراوسێ عەرەبییەکان بوون، هەر بۆ خۆشی دایکیشم، زۆر لە خەڵکی وڵاتەکانی عەرەبستانی سعوودی، کوێت و قەتەری لێبوون. هەموویان هەر عەرەبی ورگ زل بوون، کاتژمێری گرانبەهایان لە بازندی دەست کردبوو، عەگالیان لەسەر بوو، لەگەڵ سێ تا چوار ژنی نیقابپۆش و ژمارەیەکی زۆر لە منداڵ دەهاتنە هۆڵی نانخواردنی بەیانی. هەر کاتێکیش ئەوان دەهاتن، دایکم خۆی قیت دەکردەوە، ڕاست دادەنیشت و گوێکانی هەڵدەخست.

خوشکەکەشم بە ئامادەبوونی ئەو ژنە عەرەبانە دڵخۆش دەبوو. دەبوایە یەک دوو جاران ڕێی لێبگرم، نەبادا بچێتە لای ئەوان دابنیشێ و قسەیان لەگەڵدا بکا.

عەرەبەکان لە ماوەی ئەو حەفتسەد ساڵەدا، ئیسلامەتیان بەسەر کلتوورەکەی ئێمەدا سەپاند، بەڵام ئێمە تا ئێستا لەگەڵ عەرەبێکی ڕاستەقینەی عەرەبستانی سعوودیدا نەدواوین. ئێمە هەمیشە هەر دوژمن بووین، ئێستاش وا بەیەکەوە دانیشتوین و بەرچایی دەکەین.

باشە، ئەریَ بۆچی من ڕیَ لە خوشکەکەم بگرم؟ خۆ ئەو ژنێکی زۆر پرسنە، دەبوایە بە خۆی بیزانیبایە ئاخۆ چی دەکا، کەواتە من جڵەوەکەم شل کرد و ئەویش هەڵسایە سەر پیَ.

هەروەک ئێمە چەند خێزانێکی ئێرانیش بۆ سەردانی کەسوکاریان هاتبوونە «دوبەی». من پێشتر لەنێو ئەسانسێرەکدا تووشی یەک دوانێکیان بووم و یەکَ دوو قسەشمان لەگەڵ یەکدا کردبوون: "ئەریَ ئێوەش هەر بۆ سەردانی کەسوکارتان هاتوون؟"

کەچی لەگەڵ سعودییەکان، پێمان نەدەکرا کورتە دەمەتەقێیەکی وا بکەین. ئاخر هەر لە خۆیەوە ئەو شتە ڕووینەدەدا، ئەوان یەکسەر ئێمەیان دەبینی کە ئێرانیین و لەوانەیە واش بیربکەنەوە، کە نابیَ قسەمان لەگەڵدا بکەن. لیَ گەلۆ، ئەمە وا دەرنەچوو، چونکە خوشکەکەم و من بەخۆشییەوە حەزمان دەکرد، لەگەڵیان بکەوینە قسەوباس.

من پێمخۆش بوو لەگەڵ یەکیَ لە سعوودییەکان دەربارەی چیرۆکەکان قسە بکەم. گفتوگۆیەک کە لەماوەی ئەو ١٤٠٠ ساڵەی ڕابردوودا نەکراوە. هەڵبەتە ئەمەش بۆ من سەری نەدەگرت، نەخاسمە لەو هوتێلە، کە من هەر سعوودیێک دەبینم بە خۆی و سیَ چوار ژنەوە لەسەر مێزی قاوەڵتییەکە دانیشتووە. بەڵام خۆ خوشکەکەم زاتی ئەوەی کرد، هەوڵێک بدا. لەو کاتەی من لە گژ هزراندا ڕاچووبووم، ئەو خۆی گەیاندبووە سەر مێزی ئەوان. ئێستا لە لای ژنێکی گەنجی نیقابپۆشدا دانیشتووە و قسەی لەگەڵ دەکا، کە هەندێک نیقابەکەی بۆ سەرەوە لا داوە. لەوێدا کەوتمە داوی خاڵێکی لاوازەوە. خۆ بەلای منەوە نەدەبوو هەرگیز ژنە گەنجە سعودییەکان نیقابەکەیان لابدەن یان هەندیَ لاری بکەنەوە کاتیَ قسەیان دەکرد. چونکە ئەگەر وا بکەن، ئەو کات لە باب و باپیرە پێشینەکانیانم دەپرسی، پرسیاری ئەو هەموو تاوانانەم لێدەکردن، کە دەرهەقی گەلەکەمیان کردبوو.

کاتێ خوشکەکەم گەڕایەوە سەر مێزەکە، لیمپرسی: "ئەرێ باسی چیتان دەکرد؟"

ئەویش وەڵامی دایەوە؛ "شتێکی وا نەبوو. پێمگوت، من لە ئێرانەوەڕا هاتووم، ئەویش یەکسەر ورووژا."

- "چۆن ورووژا؟"
- "ئەو زۆر لە بارەی ئێمەوە پرسن بوو. دەستبەجێ باسی ئیسفەهان، یەزد، شیراز و هەمەدانی کرد. گوتی ئەو شارە ناوبراوانە وەک شارگەلێک دەبینی، کە دەستیان ناگاتێ."
- "ئەو وای گوت. وای چ وەسفێکی جوانە."
- "بەڵێ، قسەکەی وەک ئەوە وابوو، دەربارەی شارەکانی نێو خەون بدوێ."
- "خۆ هەر واشە. دەکرا تۆ وای بۆ ڕوون بکەیتەوە: دەی وەرە، جارێکیان وەرە لامان، ئەوکات لەگەڵ خۆمت دەبەمە هەموو ئەو شارانە (مەدینانە)[28]."
- "کاکە، من شتێکی دیکەم پێگوت." خوشکەکەم وای پێگوتمەوە؛ "ئەرێ باشە بۆ سەفەری ئێران ناکەی؟"
- "وەڵامەکەی چی بوو؟"
- "ئەویش گوتی: دەروازەی ئەو شارانە بە ڕووی مندا کراوە نین."

من جارێکی دیکە سەیری ژنە عەرەبەکەم کردەوە، ئەمجارەیان نیقابەکەی بەسەر ڕووخساریدا دابووەوە. ئەرێ، من پرسیارێکم لێی هەبوو، بەڵام خۆ نەدەکرا هەمیشە هەر پرسیار بکەی. من حەزم لێبوو بزانم، ئاخۆ ئەو

---

[28] نووسەر لێرەدا هەر وشەی «مدینة»ی عەرەبی بەکار هێناوە، لەوانەیە لەبەر دوو هۆکار بێ، هەم وەک ناو، هەم ئاماژەیەکیش بێ بۆ شاری دینە، بۆ جۆرە بەراوردکردنێک. و

خەڵکی مەککەیە یان نا، بەڵام خۆ بە خۆم دەمزانی، بۆیە پرسێکی لەو جۆرە زیادە بوو. کەواتە ئەو خەڵکی شارە پیرۆزەکەیە، تەنانەت ئەو هەر مەودای بەردهاوێژێک لە کەعبەوە دوورە، دەنا لە ڕاستیدا، بەم جۆرە لێبڕاوانە نەدەهات لە بەرانبەر من لەسەر مێزی بەرچاییەکەدا دابنیشێ. بەڵێ هەر بە تەنیا ئەو بیرۆکەیە، کەوا کەسێک سەر بەو شارە بێ، کە ئەڵڵای تێدا دەژی، مایەی مێروولە کردنە.

خۆ دەمویست ئەوەشی لێ بپرسم، کە ئەو هەر بەردهاوێژێک لە کەعبەوە دوورە، ئەو لەوێدا ژنە دراوسێکەی ماڵی ئەڵلا بێ، تۆ بڵێی چ جۆرە ژیانێک ژیابێ؟

بەڵام ئاخۆ بۆ چی ئەوەندە لەگەڵ هزرەکانم دوور ڕۆیشتبووم؟

لەڕاستیدا خۆ دایکم بوو پرسی: "ئەرێ ئەو ژنە خەڵکی کام شار بوو؟"

دیسان ئەو منی بردەوە سەر ڕێچکەی مەککە.

منیش پرسیم: "ناوی چی بوو؟"

خوشکەکەشم وا وەڵامی دامەوە: "ئۆو، خۆ من ئەوەم لێنەپرسی."

هەموو ڕۆژەکە هەر لە خۆم دەپرسییەوە، تۆ بڵێی ژنەکە ناوی چی بێ؛ ئامینە، عائشە، عصفورە، بهیە، جمیلە.

لەوانەیە لە میانەی ڕۆمانەکەمدا، جارێکیان لەنێو ئەسانسێرەکەدا تووشی بێم. ئەوسا هەر بە خۆم پرسیارەکەی لێدەکەم: "*ما اسمک؟*" بەڵام خۆ لەپێشدا دەبێ دایکم و خوشکەکەم لەگەڵ خۆم ببەمە دەر و پیاسەیەکیان پێبکەم.

## ٢٢

# پیاسەیەک بە نێو شاردا

**ئەوەم** بە دڵ نەبوو کە بۆ ماوەی هەفتەیەکی ڕەبەق، دایک و خوشکەکەم هەر لەنێو ئەو میرنشینەدا بهێڵمەوە. ئاخر چۆن دەتوانی ڕۆژ و شەوەکانت لەسەریەک هەر لەوێ بەسەر بەری؟ مایەی بەختەوەریم بوو، کە دایکم منی ڕاکێشا بۆ ئەو گەشتە و خوشکەکەشم بە جیهانی خۆیەوە سەرقاڵ بوو، ئەگەرنا دەبوایە، هەر لەسەر بانی هوتێلەکەوە، سەیری قوللە و تاوەرە بەرزەکان بکەین و دۆش دابمێنین.

خۆی، «دوبەی» بۆ سەردانێکی خێزانی دەستی نەدەدا، مەگەر هەر لەنێو هوتێل و چێشخانەکانیدا بمابایەوە. ملیۆنلێرە ئێرانییەکان دەیانتوانی ئەپارتمانێک لە «دوبەی» بکڕن و تێیدا چێژ لە ئازادی ڕۆژانەی ئێرەیان ببینن. هەروەها ئێرە شوێنێکی نموونەییشە بۆ ئافرەتە دەوڵەمەندە سعوودییەکان، کە لەنێو ئەو مۆڵە زەبەلاحانەدا بازاڕیان دەکرد، ئاڵتون، کاتژمێری دەستی، پێڵاو، جانتا و جلوبەرگیان دەکڕی. بۆ بەڵێندەرە ڕۆژئاواییەکانیش، مێرگە بەهەشتێک بوو، مەگەر هەر خوا بە خوایەتی خۆی بیزانیبایە، ئاخۆ خەریکی چ سەروسەودایەکن.

لەنێو ئێراندا هەموو جۆرە ناوێکی دووکان و بازاڕگەی ئەمریکی و ڕۆژئاوایی قەدەغەیە. هەر لەبەرئەوەی کۆمپانیای ماکدۆنالد هیچ دامەزراوەیەکی لەوێدا نییە، بۆیە بەڵێندەرە ئێرانییەکان شتێکیان داهێناوە و

ناوەکەیان گۆڕیوە، کردوویەتیانە ماک هۆشەنگ، ماک مەمەد و ماک ڕەزا، ئیدی من چوزانم لەو ناوە زۆر و زەوەندانە. بەڵام خۆ ماکدۆلاند دەنگدانەوەیەکی دیکە و تامێکی جیاوازی هەیە، خواردنی ماکی گەورە، خۆی لە خۆیدا لێدوانێکی سیاسیانەیە.

ئێمە زیاتر بەهێوریی ماوەیەکی زیاتر بەنێو بازاڕەکەدا ڕۆیشتین، ئەمەش هەر بۆ ئەوەی خوشکەکەم لەبەر چاوان ون نەبێ. بەڵام کاتێک ئەو قەدەم لێدانەمان درێژەی کێشا، خوشکم لە هیچ شوێنێک دیارنەبوو، من ئیدی دایکم و ژنەکەم لە سایەی گۆشەیەک ڕاوەستاند و خۆشم چوومە نێو ماکدۆناڵدێک. دیاربوو خوشکم لەوێ نەبوو. لەبەرئەوەی کەمێک دوورتر لەوێ، هۆبە ماکدۆناڵدێکی دیکەشی لێبوو، هەر بەغار چوومە ئەوێش. خەڵک لەوێ بە سێ ڕیز نۆرەیان گرتبوو، بەڵام خوشکم لەوێش نەبوو. لەپڕێکەوە ئەوم بینی لە قوژبنێکەوە لەلای ئەو مێزەی کە خواردنی لێبەڕادان دەدرا، ڕاوەستابوو.

– "دەتەوێ شتێک داوا بکەی؟"

– "نەخێر، نا،" سەرێکی بادا.

– "کەواتە چی؟"

– "هەر دەمەوێ سەیربکەم، ئاخۆ ئەوان چۆن چۆنی خواردنەکە دروست دەکەن."

منیش کشامەوە و هەندێک لە دووری ئەوەوە وەستام. ئەو سەیری دەکرد چۆن کارمەندەکانی ماکدۆناڵدەکە بە گەرموگوڕی، ژەمە خواردنەکان ئامادە دەکەن. "دەی بابڕۆین، ئەوان لە دەرەوە لەسەر ئێمە وەستاون." من دەمویست وای پێ بڵێم. بەڵام هیچیشم نەگوت، لەوێ هاتمەدەر و خۆم گەیاندەوە لای دایکم و ژنەکەم.

ژنەکەم بە هەندێ وەڕەزییەوە پرسی: "تەواو بوو؟"

- "چی تەواو بوو؟"
- "لەوێ، من چوزانم."
- "ئەو لەوێ وەستاوە، سەیری کارمەندەکانی ماکدۆناڵدەکە دەکا."
- "بۆ چی؟"
- "هەروا، سەیردەکا. ئێمە بەیەکەوە گەشت دەکەین، بۆیە پێویستە بوار بۆ یەکدی بڕەخسێنین." منیش ئەو قسەیەم پێگوتەوە.

ژنەکەم ڕووی لادا، تا پێویست نەکا لەبەردەم دایکمدا هیچ بەرسڤێک بداتەوە.

لەو کاتەی من چاوەڕێی خوشکەکەم دەکرد تا لە ماکدۆناڵدەکە بێتەدەرێ، نیگای چاوم پەڕییە سەر دووکانێکی وێنە. منیش بۆی چووم و لە جامخانەکەیدا تەماشایەکم کرد. "ئێمە هەموو شتێکمان بۆ دایبابی تۆ هەیە، ئەوانەی لە کۆمپیوتەر نازانن." ئەم ڕستەیەم لەسەر جامخانەکە خوێندەوە.

ئینجا لە دووکانەکە چوومە ژوور، لەگەڵ خودانی دووکانە کە پاکستانییێک بوو، کەوتمە قسە. ئەو لاپتۆپی ئەلبومداری دەفرۆشتن، کە وێنەی تێدا هەڵدەگیرا. ئەمەش شتێکی نموونەیی بوو تا خۆی پێوە خەریک بکا.

یەکێ لەو ئەلبومانەم کڕی کە هەروەک لاپتۆپ وابوون، بە یارمەتی دووکاندارەکە ئەو وێنانەم خستنەسەر کە بە مۆبایلەکەم گرتبوونم.

کەمێک دواتر، کاتێ لە قاوەخانەی سەر بە «ستاربوک» لاماندا، دایکم دانیشتبوو، لاپتۆپە ئەلبومدارەکەی بۆم کڕیبوو، لە کۆشی خۆی دانابوو، هەر سەیری وێنەکانی دەکرد. ئەو قامکی لەسەر دوگمەکە دادەگرت و لە نزیکەوە لە وێنەکە ڕادەما، واو ئەو هەموو وێنە دڵڕفێنانەی ڕێگەی

کاکێشان، وێنەکانی بیابان، وشترەکان، وێنەکانی خۆی، کە بە پێخواسی بەنێو لمی بیاباندا دەڕۆیشت، وێنەی ژنەکەم و خوشکم، هەڵبەتەی وێنەی نەستەرەنیش.

ئەو شتەی کرێم، لەپڕێک بۆ من بووە مایەی سەرسامی، چونکە بینیم زۆربەی دایبابە بە تەمەنەکان لاپتۆپێکی وایان لە دەستە، بە کەیفەوە لەگەڵ ڕۆڵەکانیان بە بەردەم پرسگەی هوتێلەکدا تێدەپەڕن.

لەدوایدا خوشکەکەشم هات، لەکاتێکدا شتێکی لە ڕۆژژمێرەکەی یاداشت کردبوو. لەوێش هەڵساین و هەندێکی دیکە ڕۆیشتین، تا چووینە نێو وێستگەیەکی میترۆ. شتەکە بۆ من پەیوەست بوو بە پەیژەی کارەباییەوە، چونکە لە دوایین جاردا، کە دایکم لەگەڵ باوکمدا هاتنە هۆڵەندا و سەریان لێداین، دواتر بە قەولی خۆی، دایکم هەندێ بەرتەکی سڵەمینەوەی هەبوو.

- "ئەو پەیژە کارەباییە، وای چەند سامناکە، هەر من پێم لەسەر دانا، ئیدی ئەویش ڕایکێشام." هەمیشە دایکم هەر وای دەگوت: "جارێکی دیکە پێی ناخەمەوە سەر."
- منیش پێمگوت: "دایکە، دەکرێ یەک جارێکی دیکە بیجەڕبێنی[29]؟
- "وا نەکەی." ژنەکەم هۆشداری دامێ. "ئەمە داوایەکی نەکردەیە. دەترسم لاقێکی بشکێ، ئەوسا دەبێ لەو نەخۆشخانە بۆ ئەوی دیکە بیگوازیەوە."

هەروەک هۆڵەندییەکی ڕاستەقینە، دەمویست بڵێم: ***ئێمە بیمەمان هەیە. من گرانترین بیمەم بۆ ئەو پێکهێناوە.*** بەڵام ئەو دەرفەتەم نەبوو، چونکە خۆ

---

[29] جەڕباندن: تاقیکردنەوە، هەرچەندە وشەکە لە «جرب»ی عەرەبی وەرگیراوە، گەردانیش دەکرێ.

خوشکەکەم چوو بووە سەر پەیژە کارەباییەکە و گەیشتبووە نهۆمی سێیەم. لەوێش لەبەر چاومان ون بوو.

ژنەکەم لەسەر هەق بوو، ئاخر ئێمە کەسانی ئاساییمان لەنێو ماڵباتەکەماندا نەبوو. هەر یەکێک کەم تا زۆر شتێکی نائاسایی هەبوو. هەنوکەش پەیم پێنەبرد، ئاخۆ خوشکەکەم کەم تا زۆر ئاسایی بوو یان نا. دەکرێ ئەویش هەروەک مامۆستا ڕووسییەکە وابێ، وەک ئەوەی ئازاد کرابێ، هەر بڕوا و بڕوا، وەک مامۆستاکە بەنێو شەقامەکانی بەرلیندا، جلەوی خۆی لەدەستدابێ و هەر تێی بخولێنێتەوە، ئەمەش هەمووی لەچاو ئەو ئازادییە بوو، کە لە هیکەوە بەسەری ڕاگەیشت.

منیش بە دەروازە درێژەکەی میترۆدا، بەدوایدا غارم دا. وام زانی لە دەرکەی پشتەوەی میترۆکە چۆتەدەر و وێستگەکەی جێهێڵاوە، بۆیە هەر بە پەیژە کارەباییەکان خێرا چوومە دیوی پشتەوە، بەڵام خۆ لەوێ نەبوو. کاتێکیش دیسان گەڕامەوە نێو وێستگەی میترۆیەکە، کاتێ چوومە بەردەم دەروازەکە، کە ڕێبوارەکان لەوێوە دەچونە سەر هێڵ و شۆستەکانی قیتارەکان، بینیم لەنێوان دوو کەسی ئاسایشپارێزی چوارشانەی میترۆیەکەدا دەڕوا.

- "جەنابی پۆلیس، سەلامون عەلەیکم!" وام سڵاو لێکردن. "ئەوە خوشکی منە. ئایا هیچ بووە؟ دەکرێ یارمەتیتان بدەم؟"
- "ئەو لەوێ لەپاڵ دینگەکە وەستابوو، چاودێری ڕێبوارەکانی دەکرد و تێبینیشی دەنووسینەوە. هەروەها ئەو هیچ بلیتیشی پێ نییە." یەکێ لە ئاژانەکان وای پێگوتم.

دەبوایە خوشکەکەم ڕۆژژمێرەکەی بداتە ئاژانەکان و پاسپۆرتەکەشیان نیشان بدا. پرسی پاسپۆرتەکە بەو دەمودەستە نەدەکرا، چونکە ئێمە پەساپۆرتەکانمان لەنێو سندوقی سویتەکەمان دانابوون.

هەوڵمدا بۆ ئاژانەکانی ڕوون بکەمەوە، کە ئەو نەیویستووە بچێتە سەر شۆستەکان و سوار ببێ، هەر بۆیە بلیتی نەکڕیوە. ئەوەی پێیەتی تەنیا ڕۆژژمێرێکی ئاساییە. بەڵام خۆ ئەوان هەر نەیان دەسەلماند. یەکێ لە ئاژانەکان لە ڕێی وۆلکی تۆلکییەکەدا و بەعەرەبی قسەی لەگەڵ ئافرەتێکدا کرد. ئیدی ئەوان خوشکەکەمیان لەگەڵ خۆیان بردە ژوورێکی پشتەوە و منیش دەبوایە لەوێ بوەستم و چاوەڕێ بم. ئەمەش ماوەیەکی خایاند، تا ژنەکە بە تەواوی خوشکەکەمی پشکنی. بۆ خۆشبەختی هیچی گوماناوی نەدۆزرایەوە.

ئاژانەکە سوور بو لەسەر ئەوەی پاسپۆرتەکەی ببینێ.

منیش پێمگوت: "خانم، ئێمە لە هوتێلی شێخ زاید دابەزیوین، کە چەند سەد مەترێک لێرەوە دوورە. پاسپۆرتەکەش لەوێ لەنێو گەنجینەکەمان داناوە، خۆ ئەگەر لەگەڵمان بێیت، ئەوا پاسپۆرتەکەت نیشاندەدەم."

بەڵام خۆ ئاژانە ژنەکە نەیدەویست لەگەڵم بێتە ئەوێ. من دەبوو بەغار بچمە هوتێلەکە و پاسپۆرتەکان بێنم. بەڵام خۆ لەو ماوەیەدا ئەوان خوشکەکەمیان لەگەڵ خۆیان دەبردە پۆلیسخانەکە، ئەوکات شتەکان لەدەست دەردەچوون، بەتایبەتیش بەهۆی ئەو ڕۆژژمێرەی، کە هەر خوا دەیزانی ئاخۆ چی تێدا نووسیوە. ئیدی دەستم دایە مۆبایلەکەم زەنگێکم بۆ نەستەرەن لێدا: "دەکرێ بگەیتە لامان. خوشکەکەم پاسپۆرتی لەگەڵ خۆی نەهێناوە و ئاژانەکانیش ڕۆژژمێرەکەیان گل داوەتەوە... بەڵێ، لە نزیکین، لە وێستگەی میترۆکەین."

چەند خولەکێکی پێچوو تا نەستەرەن وەک ڕۆژێکی بچکۆلانە لەسەر پەیژە کارەباییەکانەوە دەرکەوتەوە. ئەو بە عەرەبییێکی ڕەوان لەگەڵ ئاژانسەکان دوا. ئاژانەکانیش ئەویان دەناسی، کێشەکە یەکسەر یەکلابووەوە. دیسان خوشکەکەم ئازاد کرایەوە و بەرەو پەیژە کارەباییەکان ڕۆیشت. ترسام نەبادا جارێکی دیکە لەبەر چاوم ون ببێ.

"باشە شتێکی دیکە هەیە کە من بتوانم بۆتانی بکەم؟" نەستەرەن وای لێپرسیم.

خۆی دەمویست بڵێم: *دە توخوا لەگەڵماندا بە، ئەوسا هەموو کێشەیەکمان چارەسەر دەبێ*، بەڵام لەبری ئەوە پێمگوت: "زۆر سوپاس. بەبێ تۆ گەشتەکەمان ئاراستەیەکی دیکەی وەردەگرت."

ئیدی ژنەکەم هیچ مەیلی لەسەر پیاسەکردن نەما، بە خاترجەمییەوە دەیویست بگەڕێتەوە هوتێلەکە: "ئاگات لە کات بێ، ئێمە دەبێ زوو بچینە لای برازاکەم."

ئێمە بە بێدەنگی بە بەردەم دووکانەکاندا ڕۆیشتین، بەڵام خۆ ئەوە پیاسەی پێنەدەگوترا. من لە دووررا گوێم لە بانگی نوێژ بوو، لەوێوە مزگەوتێکیشم بینی.

ئێستاکە ژنەکەم ڕۆیشتووە، دەستم بەتاڵ بووە، دەمتوانی شتگەلێک بکەم کە ئەو بە دڵنیاییەوە حەزی پێنەبوو بیکەم.

- "ئەرێ بچین مزگەوتەکە ببینین؟"

ئێمە بە هێواشی بەرەو مزگەوتەکە قەدەممان لێدا. ئەوێ چۆڵ و هۆڵ بوو، هیچ ئافرەتیشی لێنەبوو.

من خوشکم و دایکمم ڕەوانەی لای نهۆمی سەرەوە، لاباڵی ژنان کرد. خۆیشم چوومە شوێنی نوێژکردن. چوومە پشت دینگەیەک دانیشتم، پشووییێک بدەم. گەرمییەکە کاری خۆی کردبوو، لەوێ لێی ڕاکشام و خەوم لێکەوت.

ناشزانم چەند بوو خەوم لێکەوتبوو، تا ئەو کاتەی گوێم لە دەنگێک بوو. بە سڵەمینەوە بێداربوومەوە، لەسەر سەرم یەکێک وەستابوو، هەندێ خۆی چەماندبووەوە، بە عەرەبی هەر لێی دووبارە دەکردمەوە : لێرە بۆت نییە بخەوی."

ماوەیەکی خایاند تا بە تەواوی بە ئاگا هاتمەوە و زانیم چ باسە. ئینجا هەڵسام و بە دوای سۆراغی دایک و خوشکەکەمدا گەڕام.

"ئەرێ نایەنە خوار؟ کاتی هاتووە بڕۆین!" من وام لە خوارەوە بانگی لاباڵی ژنان کرد.

بەڵام خۆ ئەوان دەمێک بوو هاتبوونە خوار، لەوێ وەک دوو کەسی موفەرک (پیرۆز) لەسەر تەختەبەندێک لەبەر سێبەر دانیشتبوون، چاوەڕێی منیان دەکرد.

ئای چەند دڵم پێی خۆشبوو. ئەمەش وەنەبێ لەبەر بارە ئاڵۆزەکە بێ، بەڵکو تەنیا لەبەر ئەو گۆشەنیگایە بوو، کە ئەوان بە ئارامی و ئاسوودەییەوە لەوێ، لەبەر سێبەرەکەدا لەسەر من وەستابوون. منیش بە بێدارییەوە بە دوای ئەواندا دەگەڕام.

## ٢٣

# نانی شێوان لای برازاکە

**ئێمە** تاکسییێکمان گرت و بەرەو شوێنی وادەکەمان ڕۆیشتین، لە ڕێگای خۆشماندا هەموو ئەو مۆڵ و بازاڕ و دووکان و چێشتخانە زۆروزەوەندانەمان لە دوای خۆمان بەجێهێشتن.

برازای ژنەکەم، ناوی «سیاماک» بوو، چەندین ساڵ بوو لە ئەمەریکا ژیابوو، وەک بازرگانێکی کڕین و فرۆشتنی ترومبێل کاری دەکرد. ئەو خەونەی کە ببێتە ملیۆنلێر، پێ بەدینەهات. دوای دە ساڵ مانەوە لە ئەمەریکا، لە دوایدا ئەوێ بەجێدێڵێ و ڕوو دەکاتە «دوبەی»، بەڵکو وەک دەلاڵێک ژیانێکی نوێ دەست پێبکاتەوە. دەکرێ بڵێی لە دوبەیدا خەونەکەی خۆی هێنایەدی، چونکە لەوێ وەک ئەمەریکاییەک دەژیا و هەموو ماف و زێدەمافێکی کە لە ئەمەریکای هەبوو، لەوێ سوودی لێدەبینی.

وەک دەلاڵێک، لە ئەپارتمانێک لەگەڵ ژن و کوڕەکەی دەژیا، هەروەها هێشتا دوو ئەپارتمانی دیکەشی هەبوون، بە کرێی دابوون. زۆریش نابێ چێشتخانەیەکی ئیتالی کردۆتەوە، کە لە لایەن شەش ژنی تایلەندییەوە هەڵدەسووڕا و خۆیشی نێوانگیری بازرگانە ئێرانی و کارخانە نێودەوڵەتییەکانی دەکرد، ئەوانەی دامەزراوەی خۆیان لە دوبەیدا دانابوو.

من ئەو برازایەی هاوسەرەکەم، عەیامێکە، لە ڕۆژانی خوێندکارییمەوە لە تاران دەناسم. ئەو هەر لە سەرەتاوە خەونی بە ئەمەریکاوە دەبینی. کاتێکیش لە ئێران شۆڕش هەڵگیرسا، ئەو لێیدا ڕۆیشت، چووە ئەمەریکا.

لەو کاتەوە پەیوەندیمان نەما، بەڵام لەو کاتەی بۆ «دوبەی» باریکرد، ناوبەناو لە ڕێی فێیسبووک و تۆڕە پەیوەندییەکانی دیکە، لەگەڵ یەک دەدواین.

ئەو زۆر جاران بانگهێشتی منی دەکرد. هەر دەیگوت: "دەی، دە بۆ هەفتەیەک وەرە لامان. من «دوبەی»ت لە ناوەوە پێدەناسێنم. خۆ تۆ پێویستە ئەو شتانەش ببینی. بینینی ئەم شتانە بۆ تۆ زۆر باشە."

ئەو دوو جارانەی ڕابردووش کە سەردانمان کرد، کاتێکی خۆشمان بە یەکەوە بەسەربرد. هەموو ڕۆژێ لەگەڵی دەچومە سەر کار، بەم جۆرە باشتر دەمتوانی ببینم ئاخۆ میکانیزمی ئەو میرنشینە چۆن کاردەکا.

هەنووکەش لەگەڵ دایکم، خوشک و ژنەکەم جارێکی دیکە لە ماڵەکەی ئەو دەبینەوە میوان، کە زۆر نابێ بۆ ئەو شوێنە نوێیە باری کردووە. تاکسییەکە لەبەردەم باڵەخانەیەکی بەرزدا وەستا، ئەویش بورجی «شێخ زاید بن نهەیان» بوو. یەکێک بوو لە گرانبەهاترین، جوانترین و بەرزترین باڵەخانەی «دوبەی»، شتێکی ئاسانیش نەبوو، ئەپارتمانێک لەوێ پەیدا بکەی، چونکە پەیوەست بوو بە شکۆی نمایش.

بەدەر لە ماڵ و خانوویێکی وا گرانبەها، ژمارە ترومبێلەکەشت پێگەی خۆت لە دوبەییدا دیاری دەکا. ژمارە ترومبێلێک، کە تەنیا یەک ژمارە بێ، بە هی سوڵتان یان ئەمیر دادەندرێ، دوو ژمارەییەکان هی شازادە جێنشینەکانە و سێ ژمارەییەکانیش هی میرەکانی دیکەیە. هەموو دوو ژمارەکان هی شازادەکان و سێ ژمارەکانیش هی کەسە دەوڵەمەندە گرنگەکانی دیکەی دەستوپێوەندی میر بوو. باقی ژمارەکان و ژمارە بێ وێنەکان، کە بە ئاسانی لەبەر دەکران، هەر یەکەیان بە هەزاران دۆلار کڕدراون.

ژمارەی تڕومبێلی برازاکەی ژنەکەشم ٥٦٧٨ بوو، خۆی هەر ژمارەکە بە قەد نرخی تڕومبێلەکە گران بوو. لە ماوەی یەکەمین دیدارمان، ئاماژەیەکی بۆ ژمارەکە کرد و بە پێکەنینەوە گوتی: "ئاگاداربە، من پیاوێکی گرنگم لە دوبەی. کاتێ سواری تڕومبێلەکەم ببی، دەبێ ئاگات لە خۆت بێ و باش ڕەفتار بنوێنی، چونکە هەمووان دەمان بینن."

لەبەرئەوەی دەبوایە بە لای یەک دوو خاڵی پشکنیندا تێبپەڕین تا دەگەینە لای ئەسانسێرەکە، برازای ژنەکەم بە خۆی هاتبووە خوار، لە پێشوازیماندا بوو. ئەو بە فارسی بەخێرهاتنێکی گەرمی لێکردین. کاتێکیش چووینە نێو ئەسانسێرە هەرە کەشخەکە، هەستمکرد وەک ئەوەی لەنێو ڕۆکێتێکی ئەپۆلۆدا بم و هەربینا بەرەو بۆشایی ئاسمان هەڵدرا، بەرەو مەریخ ڕۆیشت. ئەو کاتەی کە ئەسانسێرەکەش کەوتە جووڵە، وەک تیر بەرەو بەرزترین نهۆمی بورجەکە هەڵکشا.

من لەوە تێنەدەگەیشتم، ئاخۆ بۆچی ئێرانییەکان، هەمیشە هەر عەوداڵی نهۆمە بەرزەکان بوون. دەبێ ئەوەش لەو زرە هەستەی مەزنایەتییەوە هاتبێ کە لە مێژوودا هەمان بووە. ئێمە ڕژێمی پڕکەموکورتی دیکتاتۆریمان هەیە، هەمووان بە دەستیەوە دەناڵێنین، کەچی خۆشمان بە گەورەتر و باشتر لە خەڵکی دەزانین. خۆی ئەمەش شەقڵێکی ڕاسیزمانەیە.

هەرچۆنێک بێ، ئێمە ئێستا لەوێین. بە یەکجار لە نهۆمی سەرەوەی بورجی شێخ زاید، بە جوانی و ناوازەیی شەوی دوبەی سەرسام بووین، دیمەنێکی بێوێنەی هەبوو، بەسەر هەموو تاوەرەکانی شارەکەدا دەیڕوانی. ئەو دوبەیە خەیاڵکردەیە، کاتێک لە پەنجەرەکەوە تەماشات دەکرد، نمایشی جوانییەکەی خۆی بۆ دەکردی. ئاخر خۆ ئێمە دەقاودەق لەسەربانی میرنشینەکە بووین

و سەیری جیهانی دەوروبەرمان دەکرد، کە لە هیچەوە بەسەر سنووری چوارچێوەی بیابانەکە کەوتبوو.

دەرکەی ئەپارتمانەکە کرایەوە و ژنی برازاکە و کوڕە دوازدە ساڵانەکەی بۆ پێشوازیمان هاتنەدەر.

«مەرجان»، ژنە میهرەبانەکەی برازاکە، بەخێرهاتنێکی گەرمی لە دایکم کرد. دیسان دایکم هەر ئەو هەستەی هەبوو، کەوا لە ئەمستردامە. ئەویش سەری کوڕە دوازدە ساڵییەکەی ماچ کرد و گوتی: "جارەکەی دیکە، کە هاتینە لاتان، هێشتا هەر زراسک[30] بوو. ماشاڵڵا، ماشاڵڵا، ئێستا جاحێڵ بووە."

برازاکە بە پرسەوە تەماشایەکی کردم. منیش بە سرتەوە پێمگوت:

- "ئەو هەروا دەزانێ، لە ئەمستردامە."

من لە خۆم دەپرسی، باشە چۆن دایکم لە ساتێکەوە بۆ ساتێکی دیکە دەگۆڕێ، چۆن ئەم هاتن و چوونەی خەیاڵی و واقیعییە بەیەکەوە گرێ دەدا. بەڵام هێشتاش لەوە نەگەیشتم، ئاخۆ کەی ئەو لە دوبەیە کەی لە ڕێی مەککەیە، چ کاتێکیش لە ڕێی گەڕانەوەی نیشتماندایە. لەوانەیە ڕوانگەی بڕیاردەری خەسڵەتی کەسی لەلای ئەو، لەگەڵ شوێنەکەدا سەرهەڵبدەن. لەوانەشە ئەو ئەسانسێرە بۆ ئەو بەرزییە، بیرهێنانەوەی ئەمستردامی هێنابێتە پێشەوە.

---

[30] زراسک، زۆر منداڵ، بێبی.

خۆشبەختانە ژنەکەم، پێشتر ماڵباتەکەی لە بارەی دەردی لەبیرچوونەوە و ورێنەکردنی دایکم ئاگادار کردبووەوە، بۆیە ئەوانیش بە پێکەنینەوە ڕەفتاریان نواندەوە.

لەگەڵ ئەوەدا دایکم ئێمەی هەمووی بەرەو جیهانەکەی خۆی ڕاکێشا. ئەو ئێمەی لە ڕەوشێکی وەهادا دانا، کە چیدیکە خۆمان نەبین، بەڵکو هەر کەس بین و بەس.

هەر لەو ڕێگەوە، دەمەوێ سوپاسی «سیاماک» و ژن و «نادر»ی کوڕی بکەم، کە ئەو بوار و مەودایەیان بۆ دایکم و خوشکەکەم سازاند، تا بەشێکی فەرامۆشنەکراوی گەشتەکەیان بە خۆشی بەسەربەرن. هەڵبەتە ئەوەش گرنگ نەبوو، بوونەکەی دایکم لە دوبەی، لە ئەمستردام یان لە ڕێگای مەککەدا بێ.

دایکم بە درێژی باسی یەکەمین سەردانی ئەمستردامی کرد، لەڕاستیشدا هەرگیز شتی وەها ڕووینەدابوو. برازا و ژن و کوڕەکەی بەڕێزەوە گوێیان لە یادەوەرییە خەیاڵکردەکانی گرتبوو. بەو چیرۆکانەی کەشوهەوایەکی نازداری ئافراندبوو.

دوای نانی شێوان، ژنە خانەخوێیەکە لەسەر «یوتیوب»دا بە دوای موزیکی شاددا گەڕا، تا کەشێکی وا بخوڵقێنێ، ئێمە بە یەکەوە لە ئاهەنگدا بین.

من، سەر بە خانەوادەیەکی دابونەریتخوازی پیاوە جدییەکان بووم، ئەوانەی کتێبە قەبە قەبەکانیان دەخوێندوە و سەری خۆیان بە موزیکی سووکەڵە نەدەیەشاند. خۆ ئەگەر دەربارەی موزیکیش قسە بکرێ، موزیکی دێرینەی دابونەریتییانەی ئێرانی بەرز هەڵدەسەنگێندرێ.

کەواتە هەرگیز ئەو جۆرە موزیکە سەمادارە لای ئێمە نەدەبیسترا. هەروەها هەڵپەڕینیش هەر لە گۆڕێدا نەبوو. هەرگیز پوورەکانم نەدەبینین سەما بکەن، پیاوەکانیش هەر هیچ. شتەکە بە شێوەیەکی ئاسایی لەگەڵ ئێمەدا نەدەگونجا.

دایکیشم سەر بەماڵباتێک بوو، زۆر دیندار نەبوو، بەڵام بە هەر جۆرێک بێ، لای ئەوان ژنەکان لەگەڵ یەکدا هەڵدەپەڕین و سەمایان دەکرد. لەو کاتەش مێردی بە باوکم کردبوو، هیچ شتێکی وای لێ نەبیندرا.

ئێستاش ژنە خانەخوێکەمان موزیکێکی سەمائامێزی خستۆتە سەر ئامێرەکە و ئاماژەیەکی واشی پێداین کە هەڵبستین و سەما بکەین. ژنەکەم لەسەر قەپەنگی[31] ئەپارتمانەکە، تەلەفۆنی لەبن گوێی بوو، لەگەڵ باوکە پیرەکەی لە تاران قسەی دەکرد. خوشکەکەشم، کە ئەو ژنە شانازە بوو، هەروەک ماڵباتەکەی باوکم، ڕاشکاوانە نەیدەویست لە لایەن ژنە خانەخوێکەوە بانگی سەر سەما و هەڵپەڕین بکرێ. بەڵام لەپڕێکەوە دایکم هەڵسا. باسکەکانی لە هەوادا درێژکردن و خەریکبوو سمتی بادەدا. خوشکەکەم لە حەپەساویان دەستی لەسەر دەمی دانا و بە چاوێکی پڕ لە پرسیارەوە سەیری کردم.

ئای، خودای گەورە، دایکم دڵشادە و بە چاوی داخراوەوە سەما دەکا و باڵەکانیشی لە هەوادا بەرز کردوونەتەوە، هەروەک ئەوەی دوعا بکا. ئێمە هەموومان کشومات بە چاوی زەقەوە سەیرمان دەکرد.

منیش نەمدەزانی چیبکەم، ئاخر من سەر بە ماڵباتێک بووم، سەمایان نەدەکرد. کەچی لەبەرچاوم بوو، دەمبینی، یەکێک لە جوانترین کۆپلە

---

[31] قەپەنگ: بەلەکونە.

دیمەنەکانی ژیانی دایکم ڕۆڵ دەگێڕێ. دیمەنێک کە هەتا هەتایە لە لام دەمێنێتەوە.

ئینجا چوومە لای خوشکەکەم، دەستیم گرت و گوتم: "دەی وەرە، لەگەڵی سەما بکە!"

"نەخێر، تکایە نا." وای وەڵام دامەوە.

"دەی لەبەر خاتری من سەما بکە." گوێم لە خۆم بووەوە وام پێگوتەوە.

ئەویش سووربوونی لە پرسیارەکەمدا بینی، پێویستم بەوە بوو کە ئەو بە کەیف و سەفاوە ببینم. ئەویش بە نەرمی قۆڵەکانی لەیەک کردنەوە و لە هەوادا باڵی کرد و بە ئەسپایی هەنگاوی سەمائامێزانەی بەرەو لای دایکمەوە نا.

خۆشبەختی، قورسایی خۆی هەیە؛ من ئەمەم لە ئەودا دۆزییەوە. هەندێک جار بارەکەی قورسە و تۆش بەرگەی ناگری و پێت هەڵناگیرێ.

بۆ ئەوەی فرمێسکەکانم بشارمەوە، چوومە لای قەپەنگەکە. برازای ژنەکەشم بە خۆیی و بوتڵێک و دوو پیاڵە هاتە لام. شتەکانی لەسەر مێزێکی بچکۆلە دانا و جگەرەیەکی بۆ ڕاگرتم.

بە پێوە لەسەر قەپەنگەکە، کە بەدەستێک پێکەکەم گرتبوو، باسی ئەو ماوە ژیانەی دایکم، لە میانەی گەشتەکەم بۆ کرد: "مانەوەکە بووە ئەزموونێکی سەرنجڕاکێش. دایکە بە ساڵاچووەکەم بە هەموو هێزێکی خۆیەوە ڕایکێشامە جیهانی پیرییەوە. هیوام وایە نەخۆشییەکەی لێ تیرتر[32] نەبێ،

[32] تیرتر: قورستر، خراپتر، توختر.

بەڵام بە داخەوە بەرەو خراپتربوون دەڕوا. لەو ڕۆژانەی ڕابردوودا ئەو لایەنێکی جوانی پیریێتی خۆی نیشان دا.

لەوانەیە وشەی جوان، لە شوێنی خۆیدا نەبێ. دەی با وەها بڵێن ئەو لایەنە مرۆییەکەی لە کاتی ئەو گۆڕانەی لێ نیشان داوە[33]. ئەو، من دەنێرێتە سەردەمی ڕابردوو، ئینجا ڕامدەکێشێتەوە بۆ ئێستا و پاشان بەرەو فەرامۆشی، ڕۆژگارەکان وەک شەپۆڵەکان تێکەڵی یەک دەبن. لەو نێوەشدا شتێکی خۆش ڕوویدا. لە یەکێک لەو ڕەهەندانەیدا، ئەو هەر وەها دەزانێ، بەرەو مەککە سەفەر دەکا.'

برازاکەش پرسی:

- 'چۆن بەرەو مەککە؟'

- من نازانم، و ناشتوانم هۆیەکانی بخەمە ڕوو. پێموایە لە مێشکی خۆیدا، هەندێ برگەی پچڕپچڕی یادەوەرییەکانی بە یەکەوە گرێداتەوە. ئەو دەڵێ، گوایە ڕۆژێک لە ڕۆژان بەڵێنم پێدابێ، لەگەڵ خۆمی ببەمە مەککە.'

- 'مایەی تێڕامانە. باشە دڵنیای، بەڵێنێکی وات پێنەداوە؟'

- 'بە دڵنیاییەوە نازانم. خۆ نابێ هەرگیز شتێکی وام گوتبێ، ئاخر ئەو بەڵێنە لەگەڵ ڕەوتی ژیانی مندا نەدەگونجا. شایانی باسیشە دەکرێ لە میانەی گەشتە پیرۆزەکەیدا، لەگەڵ کەسانی دیکەی لەیەک گرێدابێ. ئەو هەر بەتەنیا خۆی و من وەک ڕێبواری ڕێگای حەج دادەنێ.'

---

[33] مەبەست لێرەدا، گۆڕانی باری واقیعە بۆ خەیاڵ و بە پێچەوانەشەوە. ڕستەکە زۆر کورت بوو، بۆیە لەوانەیە لەوەرگێراندا دەرەقەت نەهاتبم، پێویستی بەو کورتە ڕوونکردنەوە هەبوو. و.

- "هەڵبەتە تۆش لەگەڵیدا دەڕۆیی. ئەوەشت تا ئێستا بە ژن و خوشکەکەت نەگوتووە؟

- "نەخێر، من ئەوەم پێنەگوتوون. دەترسم ئەگەر پێیان بڵێم شتەکەی لەبار ببەم."

- "چی لەبار دەبەی؟"

- "سەفەری حەجەکەی."

برازای ژنەکەم بە دەنگێکی بەرز پێکەنی و گوتی: "تکایە لێم مەگرە، من خۆم دەلاڵم، سەرقاڵی خانووبەرەم، نەوەک سەفەری حەج و سۆفیزمی. ئەوە هەمووی لە سەرووی تێگەیشتنی منە. ئای چ ژیانێکە."

- "من بە خۆشم نازانم، بەڵام من وا بە ورووژاوی دەبینم، چونکە گەشتەکەی ئێمە شتی سەرباری دیکەشی هاتەسەر".

- "مەبەستت لەوە چییە؟" خانەخوێکەم بە زەردەخەنەیەکەوە وای لێپرسیم.

- "ئەم شتە ڕوون ناکرێتەوە."

- "بەڵام چی دەکەی ئەگەر هاتوو لەگەڵ دایکت سەفەری حەج بکەی؟"

- "من هیچ شتێکی تایبەت ناکەم، هەڵبەتە من ڕێی لێناگرم. دوێنێ ئێوارە ئەو بە پێی پەتی وەک دیندارێکی ڕاستەقینە بەنێو لمەکەدا و بە ئاراستەی مەککەدا دەڕۆیشت."

- "لە کوێ؟"

- "لە کاروانسەراکە."

- "وا مەڵێ. تۆش لێیگەڕای بڕوا؟"

- "ئاخر هیچ واتای نەبوو ئیشەکەی لێ قورستر بکەم. ئەوەش وەنەبێ، کە تۆ پێی خەمبار دەبووی. تۆ هەر دەتتوانی، ڕابمێنی، لە شوێنی خۆت بوەستی و سەیر بکەی."

- "سەیری چی بکەی؟"

- "سەیری مرۆڤ، کاتێک ئەو لێی جیادەبێتەوە."

- "من بام هیچم پێنەدەکرا." برازاکە وای گوت و لەسەر قسەکەی بەردەوام بوو؛ "ناشزانم ئەگەر لە شوێنی تۆ بووایەم، چیم دەکرد."

- ئایا دەزانی، هەندێک جار لە خۆم دەپرسمەوە ئەرێ هەموو شتێک ئەوەیە، کە وەک بیری لێدەکەمەوە. نازانم چۆن بیهێنمە سەر زار و بە وشە دەری ببڕم، بەڵام هەندێک جار، وەها بیر دەکەمەوە، دایکم کەمێ ئەو شتانە بە ئەنقەست بکا." من ئەمەم بە دوودڵییەوە گوت.

- ئەویش پرسی: "باشە چی دەکا؟"

- "سەفەرەکە، مەککە، کەعبە و باقییەکەی. لەوانەیە سەرچیخ چووبم، بەڵام پێموابێ بەشێکی لە ئاگاییەوەیە. چۆن بیڵێم، بەڵێ، ئاسایی، ئەو دەزانێ چی دەکا."

- کەواتە ئەو هەندێک یارییت لەگەڵدا دەکا و شێتت دەکا"

- "نا، نەخێر. ئەوە نا، دەکرێ هەموو شت بێ، سەر لە زوو، کاتێ بچکۆلانە بووم، دایکم دەچووە پشت پەردە و لێی دادەنیشت، ئینجا چیرۆکی سەیروسەمەرەی گەشتی خەیاڵی دەگێڕایەوە. پێموایە ئێستاش کەمێک لەوە دەکاتەوە."

- "ئاخر من پێم گوتی، وەک دەلالێکی شتی جێگیر و وەک نێوەندگیرێکی کردەی ئالوگۆڕ، من پیاوی ئەو جۆرە چیرۆکانە نیم." برازای ژنەکەم بە زەردەخەنەیەکەوە پێکەکەی خۆی هەلدا و لەسەر قسەکەی خۆیشی ڕۆیشت: "سەفەری حەجی دایکت؟"

- "بەڕاستی. بەلکو هەندێ یارمەتیم بدەی. بڕوانە، تا ئێستا تاکلایەنە لەگەلی ڕۆیشتووم، بەلام نازانم چی لێ شین دەبێ."

- "چۆن، چی لێ شین دەبێ؟"

- "ئێمە گەیشتووینەتە سەر ئەو خالە، دایکم پێیوایە ئێمە خەریکە بگەین، ئێمە لە ئان و ساتی گەیشتنین. بەلام نازانم چۆن بتوانم ئەو چیرۆکە بە کۆتاییەکی باش بگەیەنم. بەلکو بیرۆکەیەکت هەبێ؟"

برازای ژنەکەم جگەرەی بە لێوەوە گرت، چەرخەکەی داگیرساند و جگەرەکەی پێکرد، کەمێک بیری کردەوە ئینجا گوتی: "لەگەل خۆتی ببە مزگەوتە گەورە نایابەکەی شێخ زاید بن نهەیان لە «ئەبو زەبی». ئەوێ زۆر لە مالی ئەللای مەککە جوانترە."

## ٢٤

# ئامادەکاری بۆ ئەبوزەبی

من هیچ شتێکی وەهام لە بەرانبەر خوشکەکەم نەکردبوو، تا هەست بە خەتاباری بکەم. هەمیشە برایەکی چاک و جێگرەوەیەکی باوکم بووم لە نێو خێزانەکەماندا. لە ماوەی تاراوگەنشینیشمدا، ئەوەی لە دەستم هاتبێ بۆ ماڵباتەکەم کردوومە.

کە لە نیشتمانیش شۆڕش سەری هەڵدا و بە هەزاران کەس لەسێدارە دران، بە هەزارانیش بۆ چەندین ساڵ خرانە نێو کونجی زیندانەوە و بە هەزارانیش بۆ هەمیشە تێیدا مانەوە. من هیچم پێنەدەکرا، خوشکەکەم دەستنووسەکەمی لەژێر پێخەفەکەیدا شاردبووەوە و هەر بەو هۆیەشەوە گیرا. من هیچم پێنەدەکرا، لەو کاتەی هەیتەکان هاتن و بەسەر ماڵەکەمانیاندا دا، من توانیم هەڵبێم و ئەو پێی نەکرا و بەرکەوت. ئاخر چۆن ئەوەم زانیبوایە، کە ئەو لەگەڵ «جەواد» و چالاکوانەکانی دیکەدا دژی ڕژێم جووڵاونەتەوە. نەخێر، خۆ ئەوە، خەتای من نەبوو، بەڵام خۆ هەمیشە هەر پێیەوە هەراسان بووم، بەوەی لەدواییدا هەستم کرد، من ئەوەندە سەربەستیم هەیە، کەچی ئەو نەیبوو.

پێشتر من خەمی ئەوم دەخوارد، هەر لە بیرمە، جارێکیان دەترسام بەوەی کەس نەیەت و داوای دەستی بکا، هەر لەبەرئەوەی لە زینداندایە، ئیدی کەس نەیەت بیخوازێ.

بەڵام خۆ ژیان بڕیارێکی دیکەی دا. ڕۆژێکیان لە دەرکەی ماڵە کۆنەکەی باوانم درا، دایکم دەرکەی کردوەوە، بینی پیاوێکی نامۆ لەبەر دەرکە وەستاوە. دایکم هەر وای زانی، کابرا سەر بە دەزگای نهێنی ڕژێمە و بۆ پشکنین هاتووە.

دایکم هەر لە کورتی لەگەڵی بڕیبووەوە:

- "دەی بیڵێ!"
- "خانم، من بۆ کیژەکەت هاتووم."
- "من ئەوە دەزانم، بەڵام چی دیکەتان لێی دەوێ؟ ئاخر خۆ ئێوە گەنجیتان پووکاندەوە، باشە لەوە زیاتر، دەتانەوێ چی دیکەی لێ بستێنن؟"

دایکم بە جۆرە خۆگرییێکەوە وای بە کابرای بەر دەرکە گوت.

- "خانم، من هاتووم داخوازی دەستی کچەکەت لێ بکەم."

ئەمە گەمەی قەدەر بوو، دایکم بە ژیانی خۆی هیچ حیسابێکی بۆ نەکردبوو.

- "خانم، من هەشت ساڵە چاوەڕێم، دەتوانم هەندێکی دیکەشی لەسەر بوەستم." پیاوەکە وای پێگوت.

دە خولەکی ڕەبەق پیاوەکە هەر لەبەردەم دەرکە وەستابوو. پاشان دایکم گەڕابووەوە ماڵ، بە خۆی و سەرپۆشێکی سپی گوڵگوڵی ئاهەنگئامێز. دەیزانی ئاراستەیەکی شادمان بۆ ژیانی کچەکەی بەڕێوەیە. ئینجا فەرمووی لە پیاوەکە کرد و هێنایە ژوور و بە زمانی ئاماژەوە بە باوکمی ناساند: *ئەم پیاوە هاتۆتە داخوازی کچەکەمان.*

باوکە خۆشەویستەکەشم، کە نیگایەکی سادەی بۆ جیهان هەبوو، بە زمانی ئاماژەوە بە دایکمی گوتەوە: *ئەوە پیاوێکی باشە، من هیچ لاریم لێ نییە.*

دایکم بە خەندەیەک و هەر بەزمانی ئاماژە پێی گوتەوە: *خۆ تۆ نابێ ئاوا هەرزان فرۆش بی. نابێ دەمودەست پێی قایل بی. سەرەتا دەبێ هەندێ*

*پرسیاری لێبکەیێ لە باوکی، لە دایکی بپرسی، بزانی چ کارێک دەکا. لێی بپرسە ئاخۆ داهاتی چەندە، ئایا خانووی خۆی هەیە، یاخود ترومبێلی هەیە، بەم جۆرە.*

ئێستاش هەموو ئەم شتانە بوونەتە ڕابردوو. هەنووکە ئێمە لە «دوبەی»ین. من چوومە لای پرسگەی هوتێلەکە، تا پێیان ڕابگەیەنم کە بە گەشتێکی یەک ڕۆژە بە تەمای «ئەبوزەبی»ن. بە دزیشەوە پێم خۆش بوو لەوێ تووشی «نەستەرەن» ببمەوە، بەڵام خۆ ئەوە هیواخوازی پێویست نەبوو، ئاخر ئەو هەمیشە لەوێ ئامادەبوو. لەڕاستیدا هۆڵی چاوەڕوانی هوتێلەکە مەیدانی کاری ئەو بوو.

دەمودەست لە نهۆمی خوارەوە بینیم، لەگەڵ یەک دوو مەعمیل ڕاوەستابوو. کە منی بینی، بزەیەکی بۆ کردم، منیش دەستێکم بۆ بڵند کردەوە و چوومە لای پرسگەکە، تا بپرسم ئاخۆ دەتوانن ئەوان گەشتی «ئەبوزەبی»م بۆ ڕێک بخەن.

بەڵێ، ئەوان گەشتێکی بە کۆمەڵیان بە کۆستەرێک بۆ ئەوێ هەبوو، بەڵام لەبەر ڕەوشی دایکم، پێم دروست نەبوو لەگەڵ گرووپێک لە کەسانی بیانی، بە کۆستەرێک بچینە «ئەبوزەبی». ئاخر لەو کاتەدا تۆ دەبێ بە ئەوانەوە بەند بی، ئەمەش کارەکەی بۆ ئێمە سەختتر دەکرد.

- "ئەرێ تۆ شتێکت پێویست بوو؟"

گوێم لە دەنگی نەستەرەن بوو، لە پشتمەوە هات.

- "نەخێر، سوپاس، من بە دوای بڵاونامەیەک دەگەڕام. لەڕاستیدا، جارێکی دیکە سوپاس بۆ ئەو گەشتەی بیابان و سەردانکردنی کاروانسەراکە. لەوێ کاتێکی خۆشمان بردەسەر.

- ˝شایانی نییە. زۆرم پێخۆشە کە وام گوێ لێدەبێ. دەتوانم شتێکی دیکەت بۆ بکەم؟˝ ئەو وای پێگوتم و ئاماژەشی بەو ڕێبەرنامەی ئەبوزەبی دا، کە لە نێو دەستمدا بوو.

- ˝نەخێر، سوپاست دەکەم. ئێستام پێویست پێ نییە، لەوانەیە دواتر.˝ منیش وام پێگوتەوە. لە ڕاستیشدا دەمەویست لێی بپرسم، بەڵکو ئەو گەشتەی ئەبوزەبیشمان بۆ ڕێک بخەیت، بەلام هەر خۆم بە خۆمم گوتەوە. باشە ئەگەر ئەو نووسینگەی گەشتیارییەی نێوان ئێران– دوبەی کار بۆ دەزگای نهێنی ئێران بکا، کەسێکی وەک نەستەرەنیشیان بەکرێ گرتبێ، تا چاودێری بەسەر خەڵکی بە تەمەنی ئێران چاودێری بکەن، باشە ئەگەر وابێ، بۆچی جارێکی دیکە هانا بۆ خزمەتگوزاری ئەوان ببەمەوە؟ من شەرمم لە خۆم کردەوە، کە لەنێو هۆڵی چاوەڕوانی هوتێلەکەدا لە دڵی خۆمدا، بە دوای ئەودا گەڕام.

ئیدی خۆم ڕاستکردەوە و لەوێ ڕۆیشتم. ئەو دەرفەتەشم بۆ نەهێشتەوە لە ئامادەبوونی مندا، سەرەداوێکی خۆی هەڵبوێژنێ.

بەو ڕێبەرنامەی گەشتیاری نێو دەستم، گەڕامەوە نهۆمی سەروو، تا سەیرێکی بکەم ئاخۆ بە بێ نەستەرەن دەتوانم بچمە ئەبو زەبی.

## ٢٥

# بەکرێگرتنی ترۆمبێلێک بۆ ئەبوزەبی

**دوای** خوێندنەوە و لێکدانەوەی ڕێبەرنامە و هەندێ ئانا مانا لەپپانە[34] کردن، بڕیارمدا ڕۆژی هەینی بەرەو مزگەوتی گەورەی «ئەبوزەبی» بڕۆین، کە لەوێ نوێژی هەینی تێدا دەکرێ. ئەمەش بۆ ئێمە کەشێکی زێدەبارترمان بۆ دەڕەخسێنێ.

مەککە خۆی بۆ بڕواداران شوێنێکی سەرنجڕاکێشە و هەروەهاش دەمێنێتەوە. من پێشتریش گوتوومە، ئێمەی «فارس» هیچمان بەسەر عەرەبستانی سعوودییەوە نییە، بەڵام لە ڕوانگەی مێژوویێکی ساختە و هەستێکی ئایینیی و لووتبەرزیی باڵادەستێتی فارسەکانی سەردەمی دێرین، هەستێکی وەهامان لا پەیدا بووە، کە لەڕاستیدا مەککە زیاتر هی ئێمە بێ لەوەی هی عەرەبەکان بێ. ئێمە لەو ڕوانینەدا وەک ئەوە وابووین، کە کوچک لە ئاگردان گەرمتر بێ.[35] مەککە لە چاوی ئێمەدا شاری ئەڵڵایە، نەوەک هی سعوودییەکان.

دەکرێ ئەو ڕەفتارەمان لە هەڵسوکەوتی ئەو حاجییە ئێرانییانەدا ببینیەوە، کاتێ دەگەنە مەککە و پێ دەنێنە سەر خاکی ئەوێ و خۆیان لە بن هەژموونی ڕووحیدا دەبیننەوە و هەستەکەیان لە لا بەهێزتر دەبێ. مەیلی ئەوان لە هەڵسوکەوتەکەیاندا لە جاران توندتر دەبێ. جارێکیان لە کاتی

[34] ئانا مانا لەپپانە: مەبەست لێبژاردنێکە لەسەر شێوەی بەختگرتنەوە.

[35] نووسەر ئیدیۆمێکی هۆڵەندی بەکار هێناوە کە دەق دەڵێ: لە پاپا ڕۆمیتر بێ.

حەجدا، بە هەزاران حاجی بە شەقامەکانی مەککەدا وەردەبن و دروشمیان دەکێشا.

بە هەزاران دروشمکێشی بیانی بەنێو شەقامەکانی مەککەدا وەربوون، ئەوان لە وڵاتێکدا ئەوەیان کرد، کە هاووڵاتییەکانی خۆیان هەرگیز نەدەوێران وشەیەکی دەردەدڵی خۆیان دەرببڕن. ئاکنجییەکانی شارەکە بەو کردەوە چاوەڕواننەکراوەی دەسەڵاتداران حەپەسان، چونکە وایانزانی ڕاپەڕینێکە دژی خێزانی پاشایەتی سعوودیدا دەکرێ. ئیدی پۆلیسی سعوودی، نەیتوانی حاجییە خۆنیشاندەرەکان بێدەنگ بکا، بۆیە تەقەیان لێکردن و حاجیەکانیش کوژراو و بریندرایان لێکەوتەوە.

دوای ڕووداوەکەش، یەک دوو ساڵ بۆ ئێرانییەکان نەبوو بچنە مەککە. دوای ئەوەش کە دیسان ڕێگە درایەوە، هەر دوو ژنی گەنجی ئێرانی دوو لە هەیتەکانی گومرگ یاوەرییان دەکرد. ئەوان ژنەکانیان دەبردنە هۆدەیەک بە جیا و ناچاریان دەکردن جلوبەرگیان دابکەنن. وردەکاری دیکەی ئەو پشکنینانەش لە میدیاکان باس نەکران، چونکە دەبووە کێفەراتێکی[36] نیشتمانی گەورە، بەوەی بزاندرێ کەوا سعوودییەکان سواری ژنەکانمان بوونە. ئەوسا دیسان جەنگێکی دینی لە نێوان هەردوو وڵاتەکەدا هەڵدەگیرسا، لەوانەبوو دیسان شەڕەکە حەفتسەد ساڵی دیکە بخایەنێ.

ئەو کردەیەی هەیتەی گومرگی سعوودی دەرهەق بە حاجیژنە ئێرانییەکان کردبوویان، پاشخانێکی دیرۆکییانەی هەبوو: ئاخر هەر لەمێژ بوو پیاوە سعودییەکان دڵیان بۆ ئافرەتە ئێرانییەکان لێداوە، ئەوەش هەر لەبەرئەوەی، ئەو ژنانە نەیاندەویست خۆیان ڕادەستی سعوودییەکان بکەن.

---

[36] کێفەرات: کارەسات. کەتنێکی گەورە.

ئەو کێشەیەی نێوان هەردوو وڵاتەکە سەبارەت بەو ڕەفتارانە، هێشتا چارەسەر نەببوو، دانەمرکابووە، تا لە پڕ شەسەد تا حەفسەد حاجی ئێرانی لەنێو حەشاماتێکی زۆر و گوڕدەمێکی ڕێڕۆیشتنی حاجییان لە کاتی بەجێگەیاندنی ڕیتوێلی بەردبارانکردنی شەیتاندا، بن دەست و پێ کەوتن و فەوتان. ئیدی لە میدیادا شەڕێکی گەرم لەنێو هەردوو وڵاتدا بەرپابوو، هەر بۆیەشە عەرەبستانی سعوودییە سنووری لەسەر ئێرانییەکان داخستەوە.

لەو بارودۆخەشدا بوو، دایکم و من بەرەو ڕێگەی مەککە دەڕۆیشتین.

لەو نێوەدا هەر بە خۆم بڕیارمدا بە ترۆمبێلێکی بەکرێگیراو، بچینە ئەبوزەبی. ژنەکەم لەگەڵ ئەو سەفەرەدا کۆک نەبوو. ئەو نەیویست لەگەڵم سواری ترۆمبێلێک بێ، کە خۆم لێخوڕی بم و گوتی: "تۆ نابێ ئەو کارە بکەی. تۆ بە دایکت و خوشکەکەت و کارەکەی خۆت سەرقاڵی، هەر بۆیە پێویست ناکا کاری سەرشێتانەی وا بکەی، بەتایبەتیش لەو ڕێگا جەنجاڵەی نێوان دوبەی و ئەبوزەبیدا. هەرچۆنێک بێ من لەگەڵتان نایەم."

لەگەڵ ئەوەشدا من چووم، بەڵکو لە لای کۆمپانیایەک، ترۆمبێلێک بۆ ئەبوزەبی بە کرێ بگرم. لە کۆمپانیاکەدا ژنێکی گەنجی تایلەندی لێبوو، شاڵێکی گوڵگوڵی بەسەر سەردا دابوو، لە پشت مێزی نوسینگەکە دانیشتبوو.

لەوێ لە دوبەی لە هەموو لایەکەوە تووشت بە تووشی ئافرەتی تایلەندی دەبێ. ئەمەش خۆی شتێکە لەگەڵ کلتوور و کەشوهەوای میرنشینەکەدا دێتەوە. لە زۆرینەی ماڵەکاندا ژوورێکی بچکۆلانە و گەرم و ئاودەستێک لەنێو خانووەکاندا هەیە کە ژنی تایلەندی لێبێ. ئەم ژنانە هەموو کاروبارێکی ماڵەکە ڕادەپەڕێنن و زۆر جارانیش وەک چاودێری زراسک و

منداڵ کاردەکەن. هەروەها لە نووسینگەی بچکۆلە و لە هۆتێلەکانیشدا کاردەکەن.

ژنەکەی پشت مێزەکە بە ئینگلیزی لێیپرسیم: "فەرموو، دەتوانم چۆن خزمەتت بکەم؟"

منیش پێمگوت؛ بەدوای ترومبێلێکی باشدا دەگەڕێم تا دایکم و خوشکم و لەوانەشە ژنەشەکەشم لەگەڵ خۆم بۆ ڕۆژێک بگەیەنمە مزگەوتی گەورەی ئەبوزەبی.

ژنە تایلەندییەکە پێیگوتم، کە ترومبێلێکی باشیان بۆ من هەیەو دەمووردەستیش ٢٥٪ داشکانیشیان لە نرخەکەدا هەیە، ئەگەر هاتوو بیمەکە لە لای ئەوان جێبەجێبکەم. هەرچەندە من پێشتر ئەو بیمەیەم لای نووسینگەی گەشتیاری ئێران- دوبەی کردبوو، ژنەکە وای بە باش زانی، بەتایبەتیش لەبەر ڕەوشی دایکم، هەموو شتێک نۆژەن بکرێتەوە.

منیش ترومبێلەکەم هەر بۆ ڕۆژی داهاتوو پێدەویست، بەڵام ئەو نمایشێکی وای دامێ، ئەگەر بۆ ڕۆژی دوومیش بەکاریبهێنم،٥٠٪ داشکانم بۆ دەکا. هەر بە ڕێکەوتیش ئەمڕۆ دوا ڕۆژی خشتەی داشکانەکە بوو. منیش لەوە تێنەگەیشتم، ئاخۆ ئەو هەموو داشکانە لە پای چی، منیش پێم باش بوو، ترومبێلەکە بۆ دوو ڕۆژ بەکرێ بگرم، نەخاسمە لەبەردەم هوتێلەکە شوێنی ڕاگرتنی ترومبێل هەبوو.

ژنە تایلەندیەکە لەگەڵم هاتە شەشەمین نهۆمی باڵەخانەکە، بۆ ئەوەی ترومبێلە ڕاگیراوەکە لێ دەربهێنم. دوای ئەوەی هەموو کاغەزە پێویستییەکانم واژۆ کردن، سویچی ترومبێلەکەم وەرگرت و لە لای

ترومبێلەکە منی جێهێشت. منیش چوومە پشت سوکانەکە، بۆ مایەی ڕاچڵەکینم، بینیم ترومبێلەکە گێڕ ئۆتۆماتیکە. منیش پێشتر هەرگیز ترومبێلێکی گێڕ ئۆتۆماتیکم نەهاژۆتبوو. باشە پێویست نەبوو هەوڵێکی بۆ بدەم؟ لەڕاستیدا کاتی ئەوەم نەبوو، بەتایبەتیش ئەو کاتەم هەر نەبوو، ئەگەر هاتباو ژنەکەشم بیوستبایە لەگەڵمان سوار ببێ. ئیدی ترومبێلەکەم هەر لەوێ بەجێهێشت، گەڕامەوە لای ژنە تایلەندییەکە:

- "خانم، من ترومبێلی گێڕئۆتۆماتیکم ناوێ."
- "بۆ چی نا؟"

منیش دۆخی دایکمم بۆ ڕوونکردەوە، پێشمگوت ڕێگاکەش قەڵەباڵغییە، بۆیە دروست نییە سواری ئەو جۆرە ترومبێلە ببم و بیهاژۆم و پێی بچمە ئەبوزەبی.

ژنەکە بە بێدەنگی لێمەوەڕاما، دیاربوو هێشتاش تێنەگەیشتبوو، کە من لەسەر چی نیگەرانم.

منیش پێم گوت:

- "خانم، ترومبێلێکی دیکەم بدەرێ."

بەڵام خۆ ئەوان ترومبێلی دیکەیان نەبوو، ئەوە تەنیا ترومبێل بوو هەیانبوو، باقی ئەوانی دیکە بەکرێ درابوون.

پێمگوتەوە:

- "ئەگەر وابێ، لەگەڵم سەرکەوە، بزانم چۆن کار دەکا."
- ژنەکەش وەڵامی دامەوە:
- "من مۆڵەتی لێخوڕینم نییە، نازانم چۆن کار دەکا."

ئیدی دەستەوەستان بووم. هەستم بە ئازارێک کرد، ژنەکە بەستەزمانانە هاتەبەرچاوم.

ژنەکە ناوی «تامارا» بوو، ناوەکەی بە تابلۆیەکی بچووک لەسەر مێزەکە بوو. منیش لەسەر کورسی بەرانبەری ئەو دانیشتم، کەمێک بەلای ئەودا نوشتامەوە و پێمگوت: "تاماراخان، گوێبگرە، پێم حەیفە کە مۆڵەتی لێخوڕینت نییە. دەی ترومبێلێکی ئاساییم بۆ ڕێک بخە. من دەمەوێ دایکم لەگەڵ خۆم بەرمە مەککە."

ئەویش تەماشایەکی کردم، وەک ئەوەی بۆ یەکەمین جار بمبینێ. وام بینی، ئەو دوودڵ بوو، یان لەوانەیە بە باشی لێم تێنەگەیشتبێ. "بەڵام خۆ ئێمە ترومبێلی ئاساییمان نییە." ئەو وا وەڵامی دامەوە؛ "هەموو ترومبێلەکانمان، گێڕ ئۆتۆماتیکن."

"تامارا، گوێم لێبگرە، پێموابێ تۆ بودایی. دایکم حاڵی حازر بەرەو مەککە بەڕێوەیە. لێم تێدەگەی چی دەڵێم؟ مەککە، زۆر گرنگە. دەی ترومبێلێکمان بۆ پەیدابکە، لەڕاستیدا ترومبێلەکە بۆ ئەوە."

دیسان بە دوو چاوی گەورەی مۆڵەقی لێتێنەگەشتنەوە سەیری کردمەوە. ئەو وای زانی، کە کێشەی لەگەڵ ئینگلیزیەکەیدا هەیە، هەر بۆیە لە من تێنەدەگەیشت. یان لەوانەشە وای لێڕوانیبم، کە پیاوێکی ئاسایی نیم. ئەو دەستی دایە ڕۆژژمێرەکە و پەڕەکانی هەڵدانەوە، دەسکی تەلەفۆنە ڕەنگ شیریەکەی هەڵگرت و ژمارەیەکی لێدا. لەگەڵ کەسێکی تایلەندی دوا، دوو جارانیش گوێم لە وشەی مەککە بوو.

یەک چارەک دواتر، مارسدیس بێنزێکی ڕەشی نوێ لەبەر دەرگەی نووسینگەکە وەستا. ئیدی هەردوو لاڕوومەتی تامارا بوداییکەم ماچ کرد، شتێکم کرد کە لە دوبەیدا نەکردە بوو. هەروەک بودایيەکیش سەرم بۆ نوشتاندەوە، لەکاتێکدا هەردوو بەری دەستم لەیەکدا بوو، بەم جۆرە سوپاسی خزمەتگوزارییە نایابەکەم کرد.

دوای ئەوە سواری مارسدیسەکە بووم، لێمخوڕی. ئەوەش جۆرە ترومبێلێک بوو، کە زۆرباش لەگەڵ ماڵی ئەللادا دەگونجا: ڕەش، شیک و بەهێز. ئیدی دەتتوانی تا بکرێ لە لای شۆستەی پەروەردگاری مەزندا ڕایبگری.

## ٢٦

# له ئاڵۆزی ڕێگا خێراکەدا

له پڕێکەوە خۆم لەسەر ڕێگایەکی جەنجاڵدا دۆزییەوە، بە هەزاران ترومبێل بە ڕاست و چەپمدا دەڕۆیشتن، ترومبێلەکان گڤەیان دەهات و لە من ڕەت دەبوون. لەڕاستیدا بۆ من ترومبێلەکە هەندێک نوێ بوو، کاتی دەویست تا لەگەڵی ڕابێم و بزانم چۆن بەسەریدا زاڵ دەبم. لەوێ لە پیشانگایەکە، کە پێنج سەد مەتر لە دووری هوتێلەکە بوو، سواری ترومبێلەکە بووم. کاتێکیش ترومبێلەکەم لە گەراجەکەی کۆمپانیای بەکرێدانی ترومبێلەکە دەرهێنا، هەر زوو بورجەکەم بینی.

کەچی لە گەڕانەوەمدا، سەرچیخ چووم، ڕێگەم لێتێکچوو. من هوتێلەکەم ڕاستەوخۆ لەپێش خۆمدا بینی، بەڵام ئەوەشم نەدەزانی، چۆن بە ڕێگەی لاتەریبی ئەودا بگەڕێمەوە. کاتێک لە هوتێلەکە تێپەڕیم، چارم نەما، دەبوایە هەندێکی دیکە دوورتر بڕۆم، ئەوسا لە پێچی یەکەمەوە بە لای ڕاستدا بابدەمەوە. من یەک دوو کیلۆمەتر ڕۆیشتم و ڕێگا خێرایەکەم لەگەڵ یەکەمین لاداندا لێ بەجێما. نەشمدەزانی چۆن بگەڕێمەوە سەر هێڵی یەکەمین.

هێشتا یەک دوو کیلۆمەتری دیکە ڕۆیشتم، دیسان لە یەکەم لاداندا لە ڕێی پردێکەوە گەڕامەوە سەر ڕێگای شێخ زاید. کاتێکیش لە پردەکە پەڕیمەوە، دەبوایە یەکسەر بیشکێنمەوە. ئەوسا ڕێگەی لای چەپەم گرت، بۆ خۆشحاڵی من، دیاربوو ڕێگە ڕاستەکە بوو، چونکە بورجی هوتێلەکەمان لە دوورەوە دیاربوو.

ئینجا بە یەکەم لادانی لای دەستە ڕاستەم بادایەوە، بەڵام بۆ مایەی نامرادیم دەبوایە دیسان بابدەمەوە. من لەوە دڵنیابووم، ئەمجارەیان هێڵە چەپەکە، ڕێڕەوە ڕاستەکەیە، بۆیە لای چەپەم گرت، بەڵام خۆ ئەو ڕێگەیە نەدەچووە سەر ڕێگەی شێخ زاید. بۆیە هیچ چارەم نەما. دەبوایە لە یەکەم لادانداً، ئەو ڕێگەیەی گرتبوومە بەر، جێی بهێڵم.

بە شێوەیەکی ئاسایی من زوو ناشڵەژێم، بەڵام گوێم لە ژنەکەم بوو گوتی: "وا مەکە. ئەرێ باشە بۆچی سەرت بۆ کێشە دەخورێ؟"

ئیدی ئێستا درەنگ بوو، ڕێگەکەم بە تەواوی لێ ون بوو. ویستم لە ڕێگەی ڕێنیشاندەری نێو ترومبێلەکە، ڕێگەی ڕاست بۆ هوتێلەکەمان بدۆزمەوە، بەڵام خۆ ناوونیشانی هوتێلەکەم نەدەزانی، چونکە وەک گەشتیارێک پێویستت بە ناونیشانەکە نەبوو. هەر ئەوەندە بەس بوو ناوی هوتێلەکەت بە شوفێری تاکسیەکە بڵێی، ئەویش بەبێ گرفت دەیبردیە بەردەم شوێنی مەبەست. هەر بەم جۆرەش، لەم چەند ڕۆژانەی ڕابردوودا، چەند جارێک بە تاکسی بەرەو ڕێگای شێخ زاید و هوتێلەکەدا گەڕاوینەتەوە. لەبەرئەوەی پێشتر ناونیشانەکەم نەخوێندبوونەوە، بۆیە وەک سەرشێتێک لەسەر هێڵێکەوە دەچوومە سەر ئەوی دیکە و یەک سەعاتی ڕەبەقی پێچوو تا هوتێلەکەم دۆزییەوە. دەبوایە بە خۆم پێبکەنمەوە، من وەک ئەو بۆرە پیاوەم لێهاتبوو کە سەری لێتێکچووبوو، لەوەی لە سەر هێڵی ئا بچێتە سەر هێڵی بێ، چەندین جار هەر دەڕۆیشت و بە بنبەست دەگەیشت.

لە کۆتاییدا هەر لە گۆترە بە ڕێگەیەک لامدا، بەنیازبووم دابەزم و لە یەکێک بپرسم، بەرەو ڕێگای کۆمپانیای بەکرێدانی ترومبێلەکە لێمخوڕی و لە پشت

بورجە بەرزەکانەوە ڕۆیشتم. گەیشتمە لای پشتەوەی بورجەکان، کە هیچ کەسی لێنەبوو.

لەوێ ترومبێلەکەم ڕاگرت، هەندێک پشووم دا، بیرم لێکردەوە. لە پڕێک تاکسییێکم لە دوورەوە بەدی کرد. شتێکم بۆ هات، بە هەردوو دەستم ئاماژەم بۆ تاکسییەکە کرد. تاکسییەکە هاتە بەردەمم، لێخوڕەکە پاکستانی بوو، بیری بۆ ئەوە نەچووبوو کە مارسدیسەکەم پێیە. هەوڵمدا بە ئینگلیزی و عەرەبی و ئوردویی تێیبگەیەنم، ڕێگەکەم ونکردووە و بەڵکو بمگەیەنێتەوە لای هوتێلەکە. بەڵام دەبوایە من سواری ترومبێلەکەم بوبامایەوە. نەخێر، ئەو تێنەگەیشت. وەک شوفێری تاکسی لەو جۆرە بەسەرهاتانە ڕانەهاتبوو، تۆ دەبوایە ناوی تاوەرەکەت پێ بگوتبایە، ئینجا ئەو تۆی دەگەیاندیە شوێنەکە.

من سەرلەنوێ بۆم ڕوونکردەوە، وەها پێدەچوو منی بە تاوانبارێک زانیبێ، بۆیە نەیدەویست هاوکارییم بکا.

"من دوو هێندە پارەت دەدەمێ." وەهام پێگوت. ئەمە دۆخەکەی زیاتر شێواند، چونکە وایزانی مارسدیسەکەم دزیوە و دەمەوێ ئەویش لە کەتنەکە تێوە بگلێنم.

بەدوای قسەیەکی فریادڕەسانەدا گەڕام و پێمگوت: "دایکم چاوەڕێم دەکا. منیش دەمەوێ بیگەیەنمە مزگەوتە گەورەکەی ئەبوزەبی. من ئێرانیم و تۆش پاکستانی، ئێمە براین."

ئەو بیری لە قسەکەم کردەوە. بۆ ئەوەی گومانەکەی نەهێڵم، دەستم بۆلای ڕاداشت و پێمگوت: "وێڕای ئەوەش، من لە هۆڵەندا دەژیم و تۆش لە دوبەی، ئێمە هەردووکمان ئاوارەین[37]، بێ لانەین، لە تاراوگەیین."

ئەوسا بە دوودڵیەوە گوتی "سەلامون عەلەیکم." دەستی گوشیم و ئاماژەی ئەوەی دا، بە دوای ئەودا لێبخوڕم.

من زۆرجاران وشەی *سەلامم* بیستووە، وشەیەکی تەلیسماوی بووە، بەڵام دیارە وشەی *ئاوارە* – یان دەربەدر و بێلانە- ش هەروایە.

ئینجا سویچم لە ترومبێلەکە بادا و بە دوای تاکسییەکە لێمخوڕی. بۆ مایەی دڵخۆشیم، بە دوو تا سێ خولەک، گەیشتینە لای هوتێلەکە. وەک ئەوە وابوو، جادوویی جنۆکەکانی فانۆسەکەی عەلائەدین، پەڕجووییێکی لە بیابان ئافراندبێ.

خۆی نەدەبوایە ژنەکەی کۆمپانیای بەکرێدانی ترومبێل یان نەستەرەنم ماچ کردبا، بەڵکو دەبوایە ئەو پاکستانییە ڕیش نەتراشیوەم ماچ بکردبایە: ئیدی باوەشم پێداکرد دوو ماچم لە ڕوومەتە ئارەقاوییەکەی کرد. لە چاکەی ئەوەشدا دوو گەڵای پارەی میرنشینەکەم لە بەرکە دەرهێنان و بۆم ڕاگرتن، بەڵام ئەو هیچ پارەی لە من وەرنەگرت و گوتی: "سەلامون عەلەیکوم. ئێمە براین." ئەو کاتەی ویستم پارەکەی بخەمە بەرکی کابرای پاکستانی، دیسان ڕەتی کردەوە: "نەخێر. ئێمە هەردوو لامان ئاوارەین. پێویستیمان بە یەکدی هەیە."

---

[37] نووسەر وشەی فارسی ئاوارەی Avareh نووسیوە.

ئەوکات واتای نوێم بۆ وشەکانی وەک دەربەدەر و بێلانە بۆ دەرکەوتن. ئەمەش بە دروستی واتای: ئارامی، هێواشی و برایەتی دەگەیاند.

ترومبێلەکەم لە بەرانبەر هوتێلەکە ڕاگرت و خۆشم چوومە نێو هوتێلەکە.

"ئەرێ تۆ باشی؟" نەستەرەن بە هەراسانییەوە وای لێپرسیم.

من پەشۆکاو دیاربووم.

منیش پێمگوتەوە: "بەڵێ باشم."

بە سەرنجەوە گوتی: "ترومبێلێکی جوانە. بەرەو ئەبوزەبی؟"

شتێکی بێڕێزی بوو ئەگەر بە بێ وەڵام بڕۆی و قسەکەی پشتگوێ بخەی.

منیش پێمگوتەوە: "هێشتاش نازانم، لەوانەیە وا بێ، بەڵام لەبەر بارودۆخی دایکم دوودڵم ئاخۆ کارێکی دروستە یان نا."

"هەرچۆنێک بێ، ئەگەر پێویستت بە من بێ، دەزانی لە کوێ دەمدۆزیەوە." ئەو ئەمەی بە خەندەیەکەوە پێگوتم، لەکاتێکدا دەستی بەسەر پرچیدا هێنا.

بەڵێ، دەمزانی ئەگەر پێویستیم پێی هەبا، لە کوێ بیدۆزمەوە، بەڵام هەر بە ڕاستی دەبوایە واز لەو ئەندێشەیە بێنم.

"هەڵبەتە،" وام پێگوت و بەنێو هۆڵەکەشدا بەرەو ئەسانسێرەکە ڕۆیشتم. کاتێکیش گەیشتمە سەرەوە، بەبێ حەوسەڵەیی پەنجەم لەسەر زەنگی سویتەکەمان داگرت.

"ئەرێ ئەو هەموو وەختە لە کوێ بووی؟ بۆچی وا نارێک دیاری؟" ژنەکەم وەهای لێپرسیم.

منیش چوومە لای پەنجەرەکە، دەستم دایە دووربینەکە و گوتم: "دەی وەرە تەماشا کە. من ترومبێلێکم پەیداکرد. لەوێ ڕامگرتووە، ڕەشەکە خۆیەتی."

کاتێکیش بە دووربین سەیری ئەو ناوەم دەکرد، بینیم نەستەرەن لەسەر شۆستەکە وەستا بوو. خۆ من بۆنێکی گرانبەهای «چانێل»م لە سوپاسنامەدا نەدابوێ، بەڵام لە سەفەری حەجەکەمدا دەکرێ وەک دیاری، شووشەیەک گوڵاوی بۆ بێنم. شووشەیەک لەو جۆرە مارکەیە بێ، کە پەردەی ماڵی ئەڵلای پێ دەشۆن.

## ٢٧

# جەنابی سەخاوەت

**هەمووان**، تا دایکیشم کەیفیان بە مارسدیسەکە هات. کاتێکیش یارمەتی دایکم دا، تا سواری ترومبێلەکە ببێ، بە نەرمییەکەوە گوتی: "ئەمەیان دە جاران لە ترومبێلەکەی دیکەت باشترە. باوکت دڵخۆشە بەوەی ئەو زەحمەتییەم بۆ دەکێشی."

منیش نەمدەزانی لەو کات و ساتەدا ئەو خۆی لە کوێدا بینیوەتەوە، چونکە ئاماژەی بە یەکەم سەردانی بۆ ئەمستردام کرد، کاتێک لەگەڵ باوکمدا بەیەکەوە هاتبوون، ئەو کات ترومبێلێکی شڕوشەقم هەبوو.

دوای ساتێک لە بێدەنگی، هەڵیدایێ و گوتی: "من بەم گەشتە سەختەوە، زەحمەتییەکی زۆرم دایە بەر تۆ. بەبێ تۆ هەرگیز وا ئاسان نەدەبوو. ئەڵڵا دەست بە باڵی کارەکەتەوە بگرێ."

منیش بە نەرمی دەرکەی ترومبێلەکەم پێوەدایەوە.

ژنەکەم کە وای بینیم پێیگوتم: "بەچی پێدەکەنی؟"

منیش گوتم: "بەهیچ."

من ئێستا تێدەگەم، کە چ خۆشیەکی منداڵانەم لەو وڕێنەکردنەی دایکم بینی. وشەی دیمێنشیا (وڕێنە) لە تافی منداڵی منی ئەوێ دەمێ نەکەوتبووە سەر زار و زمانی خەڵکی، بەڵام مرۆ حاڵەتەکەی وەک لێکەوتەیەکی پیری دەبینی. زۆرجار خەڵکم دەبینی لەو ڕەوشەدا پەنایان بۆ ئایەتێکی قوڕئان دەبرد و دەیانخوێندەوە: "تۆ لەدایک دەبی، گڕوگاڵ دەکەی، گەشە دەکەی،

هەراش دەبی، پیر دەبی، لە تەمەندا بە ساڵدا دەچی و دیسان وەک منداڵ دەکەویە گاگۆڵکێ و دەگەڕێیتەوە خاک، دەگەڕێیتەوە ئەو شوێنەی کە لێی هاتبووی.

من هەر شەش حەفت ساڵان بووم، کە تووشی حاڵەتێک بووم و دواتر نەخۆشی وڕێنە (دیمێنشیا)م ناسی. هەموو ڕۆژانی هەینی دوو کەسی ناوازە سەردانیان دەکردین، ئەوانیش بەڕێز «سەخاوەت»[38] و خانمەکەی بوون. دوو هاوسەری خانەدانی نەریتپارێز بوون. پیاوەکە پسمامی باوکم بوو، ئەوان لە قەڵایەکی دێریندا دەژیان، کە بە باخ و باخاتی گەورە گەورە دەورە درابوو. هەرچەندە ڕۆژانی دەسەڵاتداری ئاغایەتی (فیودالی) بەسەرچووبوو، بەڵام جەنابی «سەخاوەت» هەمیشە وەک ئاغایەک پۆشتە پەرداغ بوو، جوتە جزمەیەکی کەشخە و دارێکی بۆرەی لەبن هەنگڵی ڕاستی دەنا، هەر دەتگوت تازە لەسەر زینی ئەسپەکەی دابەزیوە. ئینجا شەپقەیەکیشی لەسەر دەنا و هەمیشە بۆینباخێکی پەپوولەییانە[39]ی دەبەست. ژنەکەشی فیستانی کۆن و گرانبەهای لەبەردەکرد و هەمیشە شاڵێکیشی بەسەر شاندا دەدا، بازنی ئاڵتونی نایابی لە دەست دەکردن و جانتایەکی نازداری لە کەوڵ دروستکراویشی پێبوو.

هاتنی ئەو جووتە نائاساییە، کە مژدەی هاتنی دوو کەسی کەیفسازی دەگەیاند، هەمیشە بۆ ئێمەی منداڵانی ماڵ، مایەی خۆشی بوو. ژنەکە هەمیشە شیرینی لەنێو سەبەتەیەک کە مێردەکەی بۆی هەڵدەگرت، بۆ ئێمەی لەگەڵ خۆی دەهێنا.

---

[38] Saghavat

[39] مەبەست بۆینباخی پەپوولەییە نەوەک بۆینباخی درێژی ئاسایی.

لەبەرئەوەی ئێمە لەگەڵ مامەکەمان لە خانوویێکی گەورەدا دەژیان، ژمارەی منداڵەکان دە دوازدەیەک بووین. ئێمە هیچمان لە بارەی ئالزهایمەر یان دیمێنشیا نەدەزانی، بەڵام ئەوەمان دەزانی، کە پیاوە خانەدانەکە بە خۆی و شەپقە و جزمە و بۆینباخە پەپوولەییەکەی ببووەوە منداڵ. هەر کاتێک جەنابی «سەخاوەت» و خێزانەکەی دەگەیشتنەماڵمان، ئێمە بەرەو پیریان غارمان دەدا. دەمانبینی، کاتێک جەنابی «سەخاوەت» چاوی بە ئێمە دەکەوت، چۆن دەگەشایەوە. بەڵام خۆ دەبوایە ئێمەش وەک ئەوان ئارامگر بووباین و چاوەڕێمان بکردبایە تا خانم «سەخاوەت» چاکوچۆنی لەگەڵ دایک و بابمانی دەکرد. ئەمەش کاتێکی زۆری دەخایاند، ئینجا دوای ئەوە شتەکانی نێو سەبەتەکەی دەردەهێنا و نوقڵ و نەباتی بەسەرماندا دابەش دەکرد.

پاشان جەنابی «سەخاوەت» وەک منداڵێکی گەورۆنە دەستی دەدایە دارەکەی بن هەنگڵی، بە دواماندا دەهات، وەک ئەوەی بیەوێ نوقڵ و نەباتەکانمان لێوەربگرێتەوە. ئێمەش بە هەموو لایەک هەڵدەهاتین، ئەویش بە دوامان دەکەوت. ئەو بەدوای ئێمەدا دەهاتە لای دارەکان و سەر ڕووبارەکە، تا ئەو کاتەی ئارەقەی شەکەت و ماندووبونی دەردەدا، ئینجا لەسەر تەختەبەندێک لە تەنیشت گۆمەکە دادەنیشت.

جەنابی «سەخاوەت» چەندان جار ناوەکانی ئێمەی لەبیر دەچووەوە، ناوەکانی ئێمەی لەگەڵ یەک تێکەڵ دەکرد. ئێمەش خۆمان پێدەناساندەوە، ئەو کاتەش تا ژمارە سێمان دەژمارد، پاشان ناوەکانمانی هەر بە بیر نەدەهاتەوە، ئیدی ئێمەش لە قرتەی پێکەنینمان دەدا.

هەندێ جار ئێمە لەنێو باخەکەماندا ئاروومان لێدەکردەوە، ئینجا نیشانی ئەومان دەدا و پێمان دەگوت : "مام «سەخاوەت» ئەمە چی پێدەگوترێ؟"

ئەویش بیری لێدەکردەوە، ئەوسا بە ڕوخسارێک کە هەر ڕاستی لێدەباری، دەیگوت: "باینجان."

دیسان لە قرتەی پێکەنینمان دەدایەوە.

ئێمە هەر لە گۆترە لەنێو کتێبخانەی ماڵەوە دەستمان دەدایە کتێبێک و نیشانمان دەداو پێماندەگوت: "مام سەخاوەت دەکرێ بۆمان بخوێنیتەوە؟"

ئەویش کتێبەکەی وەردەگرت، چاویلکەکەی دەکردە چاو، بۆی دەخوێندینەوە، خوێندنەوەکەی ئەو دەیان جار خۆشتر و وروژێنەرتر بوو لەوەی هەر بەڕاستی لەنێو دەقی کتێبەکەدا هاتبوو. چونکە ئەو لە خۆیەوە چیرۆکی دەهۆنینەوە، هیچیشی پەیوەندییان بەسەر یەکەوە نەبوو. ئەوەی دەیخوێندەوە هەموو برگە و بەندی گێڕانەوە لەیەک جیاوازەکانی دیکە بوون، ئەو لێکی گرێدەدان. بەو هۆنینەوە خەیاڵکردەی خۆی، ئێمەی دەبردە نێو جیهانێکی ئەندێشاوی، تێیدا ئێمە وەک مەلێکی باڵ ڕەنگین هەڵدەفڕین.

بەم جۆرە ماوەیەک کڕوبێدەنگ بە دەوری دەماینەوە، ئەویش سەر لەنوێ ئێمەی بە سەرەداوێکی خەیاڵاوی دەبردەوە ئاسمان.

نیو سەدە دەبێ جەنابی «سەخاوەت» کۆچی دوایی کردووە، بەڵام ئەو هەمیشە لەنێو یادەوەری مندا ماوەتەوە، لەسەر تەختەبەندەکەی نزیک گۆمەکە بەخۆی و شەپقەی سەری و بۆینباخ و دارەکەی دەستی هەروەک جادوگەرێک دانیشتووە، ئێمە لەگەڵ خۆی دەباتە جیهانە ئەفسووناوییەکەی خۆی.

پاش ساڵانێکی دوور درێژ، ئینجا پەیم بەوە برد، ئەو جیهانەی ئەو بۆی دەچوو، تەنیا لە ڕێی پیری و بەساڵداچوون و مێشک هەژان ڕێی تێدەچوو. جیهانێکی ناوازە یان ڕاسترە بڵێین جیهانێکی ئاسایی کە ئێستا دایکمی تێکەوتووە.

۲۸

# بەرەو بازاڕ

**دوای** ئەوەی ترومبێلەکەمان بۆ ڕۆژێکی دیکە زیاتر بەکرێ گرت، دەمانتوانی بە کاوەخۆ شوێنی دیکەش بگەڕێین. ئیدی لەوە نەدەترسام ڕێگەکەم بزر بکەم، چونکە ناوونیشانی پێویستم لەسەر کۆمپیوتەر دەرهێنان و خستمە نێو سیستمی ناڤیگێشنی ترومبێلەکە.

یەکێک لەو شوێنانەی دەمویست لەگەڵ خوشکم بۆی بچم، ئەو باخە سێوە هاوچەرخە بوو، کە برازای ژنەکەم پێیباشبوو بۆی بچین. ئێمە هێشتا بەڕێ نەکەوتبووین، برازای ژنەکەم تەلەفۆنی بۆ کردم و بە تەوسەوە گوتی:

- "ئەرێ لەکوێی؟ هێشتا نەگەیشتیە مەککە؟"
- "نەخێر، هێشتا ماویەتی."
- "گوێبگرە، ئێمە کۆمەڵە برادەرێکین، ئاوها دوای ماوەیەکی زۆر بەیەکەوە کۆدەبینەوە و تکە و کەباب لێدەدەین. هەر جارە و لای یەکێکین. ئەم جارەیان لای بازرگانێکی کوتاڵفرۆش میوانین، خانوو و باخێکی گەورۆنەی هەیە و مەلەوانگەشی تێدایە. برادەرەکانم زۆریان پێخۆشە، کە تۆشمان لەگەڵدا بی. پێموایە دایکیشت ئەوێی پێخۆش دەبێ."
- "زۆر سوپاس، بەڵام خۆ ئێمە چوار کەسین. ئایا ئەوە نابێتە بار بەسەرتانەوە؟"
- "نەخێر، گرفت نییە. هەمووان خواردنی خۆیان لەگەڵ خۆیان دەهێنن، ئێوەش دەتوانن هەر بۆ ناو، شتێک لەگەڵ خۆتان بێنن.
- "زۆر باشە. سوپاس کە تۆش حیسابی دایکمت کردووە."

- "شایانی نییە، بەڵام دەمەوێ شتێکی دیکەشت پێ بڵێم. من لەوەت دڵنیا ناکەمەوە، کەشی دانیشتنەکە بە دڵی تۆ بێ. ئاخر ئەوانە هەموویان بزنسمانی ڕیشدارن، ئەوانە لە نموونەکەی تۆ نین. بەڵام خۆ زۆر باشیش دەبێ، ئەو جۆرە کەسانەش بناسی."
منیش پێمگوتەوە: "زۆرباش دەبێ."
ڕۆژەکە ڕۆژێکی گەرم بوو، بەڵام بۆ خۆشبەختی ترومبێلەکە فێنکەرەوەیەکی نایابی تێدا بوو. من حەزم لێبوو بچمە بازاڕ، بەڵام لەوە دڵنیا نەبووم، ئاخۆ لەگەڵ دایکم، بەو ڕەوشەی تێکەوتووە، گونجاوە بەنێو حەشاماتدا بەپێ بڕۆین. دەمزانی برازاکەی ژنەکەم، هەموو ئەوانەی بازاڕی دەناسین، خۆ دەکرێ هەندێ ناوونیشانم بداتێ، تا سەرمان لێنەشێوێ و بزر نەبین.

"ئەرێ کەمی بوەستە،" من لە تەلەفۆن وام پێگوت: "باشە شوێنی خۆش لە بازاڕەکە پێنازانی؟ دەمەوێ دایکم لەگەڵ خۆم ببەمە ئەوێ."

ئەو هەندێک بیری لێکردەوە، لە تەلەفۆنەکە گوێم لە چرکەی چەرخەکەی بوو جگەرەکەی پێداگیرساند. لەبەرچاوی خۆم وام دەبینی، مژێکی لە جگەرەکە دا و دووکەڵەکەی هەڵمژی و پاشان دەریدایەوە. ئینجا بە پێکەنینەوە پێیگوتم:

- "نەخشەیەکم هەیە، من دەتوانم ڕاستەوخۆ دایکت بەرمە بازارە خوداییەکەی مەککە، ئیدی پێویستت بەوە نامێنێ چیدی بیگەیەنییە مەککە."

- "مەبەستت چییە؟"
- "ئێستا تێدەگەی. من لە سەعات دوازدەدا دیدارێکم هەیە، ئایا پێت باشە لە سەروبەندی سەعات یەکدا بێمە لای هوتێلەکە و هەڵتان بگرم؟"
- "ئۆی، لەوە باشتر نابێ. من بەپەرۆشەوە چاوەڕوانم. ئێمە بەتەمابووین بچینە باخی سێوان، بەڵام ئەمە دوادەخەین بۆ کاتێکی دیکە. لە

سەرێکی دیکەشەوە، خۆ پێویست ناکا بەدواماندا بێی، ترۆمبێلێکم پەیداکردووە."

- "زۆر باشتر، کەواتە لە دەوروبەری سەعات یەکدا لای وێستگەی میترۆی ناو بازاڕەکە یەکدی دەگرینەوە. لەوێ بە ئاسانی دەتوانی ترۆمبێلەکەت ڕابگری. تا ئەوکات، خواحافیز."

هەڵبەتە بازاڕەکە هیچی نوێی بۆ ئێمە تێدا نەبوو، هەموو دووکانەکان پڕبوون لە شتە هەرزانبەها چینییەکان، بەڵام لەگەڵ ئەو خزمەمدا هەر دەبێ شتێکی نوێ ببینین.

پێشتر دەمزانی حاجییە ئێرانییەکان، هەر کاتێک، بەزۆریش هەروابوو، دوای دوو مانگ لە حەجەکەیان، کە لە مەککە دەگەڕانەوە، هەگبەکانیان پڕی دیاری و یادگاری بوو؛ لەچک و سەرپۆشی ڕەش بۆ ژنان، کاتژمێری دەستی بۆ گەنجان، دووگردی نوێژ، قوماشی ئاڵوواڵا، تەسبیح، ئەنگوستیلە، گۆرەوی، کڵاو، گوڵاو، سابوون و زۆر شتی دیکەش.

لەبەر پێی حاجیانیشدا مەڕ سەردەبڕدرا. ئیدی بۆ ماوەی هەفتەیەک ئاهەنگ دەگێڕدرا و فراوین و شێو ئامادە دەکرا.

یەکێک لە جوانترین ئەو دیارییانەی سەردەمی منداڵیم وەرمگرتبێ، کاتژمێرێکی دەستی بوو، لە مەککەوە بۆیان هێنابووم. کاتژمێرێکی هەرزانبەهای چینی بوو، لەسەر سەعاتەکە ئایەتێکی قورئان و وێنۆکەیەکی کەعبەی لەسەر نەخشابوو. بۆنی بۆنگوڵاویشی لێدەهات.

کاتژمێرەکەم بریسکەیەکی خودایی لێهەڵدەستا. کاتێک دەمکردە دەستم، سەیری ئاوێنەم دەکرد، لەخۆشیان خەنی دەبووم.

لەبەرئەوەی لە ئاپۆرای پڕ لە خەڵکی دەوروبەری بازاڕ دەترسام نەبادا ڕێگەم لێ ون ببێ، بۆیە بەوەخت و بەر لە دیدارەکە ڕۆیشتین. لەوێ سەرێک بە پێ تێگەڕاین، تا ئەو کاتەی خزمەکەمان هات و پرسی:

- "ئەرێ چیتان کڕیوە؟"
- "شتێکی وا نییە. جانتایەک بۆ دایکم تا دیاری و یادگار بۆ کەسوکار لەگەڵ خۆی بباتەوە."منیش وا وەڵامم دایەوە.
- "ئۆو، ئەمە زۆر گونجاوە." پاشان گوتی: "دەی بابڕۆین."

ژنەکەم و خوشکەکەم بە یەکەوە بەنێو بازاڕدا پیاسەیان دەکرد. منیش پیلی دایکم توند گرتبوو، بە دوای خزمەکەمان بەنێو بازاڕە جەنجاڵەکەدا ڕۆیشتین.

به هۆی ئەوەی خزمەکەمان دەلاڵ بوو، لەنێو بازاڕدا ڕایەڵەیەکی پەیوەندی باشی ڕاچاندبوو، هەمووان دەیانناسی. ئەویش بە ڕەوانی بە ئینگلیزی، عەرەبی و پاکستانی دەدوا، هەروەها دەیتوانی بە زمانی چینیش بەڕێ خۆی لە ئاوێ بپەڕێنێتەوە. ئێمەش بە دوای ئەودا دەڕۆیشتین، ئەو سڵاوی لە هەمووان دەکرد و تۆقەی لەگەڵ دووکاندارە سعوودی، ئێرانی، عێراقی، ئوردویی و چینییەکاندا دەکرد.

هێندەی نەبرد ئێمە گەیشتینە لای کۆمپانیایەکی سعوودی، کە کەلوپەلی چینی بۆ مەککە دەنارد. خۆی بە هەزاران لەو جۆرە دووکانانە لە سەرتاپای وڵاتەکەدا هەبوون، شتەکانیان لە چین بەڕادان دەدان و لە ڕێی دوبەیەوە دەیانگەیاندە وڵاتەکانی خۆیان.

دوبەی یەکێک لە بەندەرە هەرە هەرزانەکانی دنیایە. ئەو کاتەی کەلوپەلەکانی چینی بە پاپۆڕی گەورۆنە گەورۆنە دەگەنە دوبەی، نرخەکانیان بەرچاو هەرزان دەبێ.

خزمەکەمان منی بە یەکێ لە دووکاندارەکان ناساند، باسکی کابرای گرت و جیای کردەوە. گومانم بۆ ئەوە چوو، باسی حاڵەتی وڕێنەی دایکمی بۆ بکا، کە دەیەوێ بچێتە مەککە، چونکە کابرای سعوودی تەماشایەکی من و دایکمی کرد و بە نەرمیش سەری لەقاند. ئەوسا ڕووی خۆی لە من و دایکم کرد و گوتی:

- "انت قادم معي؟"

دایکم بە چاوی پرسیارەوە سەیرێکی کردم. منیش پێمگوت: "ئەو پیاوە دەڵێ، لەگەڵ من دێی!"

بە مەودایەک بە دوای کابرای سعوودی و دایکمدا ڕۆیشتم. ئەویش دایکمی گەیاندە هۆڵێکی گەورە، کە بە هەزاران، لەوانەیە بە ملیۆنان سەرپۆشی ڕەش لەنێو جانتای پلاستیک داندرابوون، هەموویان وێنەی کەعبەیان لەسەر درابوو. هەزاران، بەڵکو ملیۆنان ڕووبەند، دەسرۆکی سەر، نیقابی لێبوو کە بەرەو مەککە دەنێردران. ئیدی پێویست نەبوو بچینە بازاڕی مەککە، ئاخر خۆ ئێمە لەوێ بووین.

دووکاندارە سعوودیەکە چارۆگێکی ڕەشی دایە دەستی دایکم. ئینجا لەگەڵ خۆی بردە کۆگاکە، کە پڕی کاتژمێری دەستی بوو. لەو کزە ڕۆناکاییەدا، بە ملیۆنان کاتژمێر دەبریسکانەوە، دایکم کە وای بینی دۆش داما، ئەو هەموو کاتژمێرانە کە بە ئایەتی قورئانی ڕازابوونەوە. لایەنی پڕشنگداری ئەو هەموو کاتژمێرانە خۆی بەشێکی پڕشنگداری مەککە بوو.

بە بۆچوونی من، دایکم بە چاوەکانی خۆی گەورەیی ئەڵلای بۆ دەرکەوت.

بکەن. لە ماوەی یەک دوو ساڵدا بە ملیاران دۆلار دەستکەوتیان بەدەستهێناوە، بە جۆرێک باب و باپیرانیان هەر خەونیشیان بەو جۆرە دەوڵەمەندییەوە نەدەبینی. ئەوان وایان لێهات، نەیاندەزانی چی لەو هەموو سەرمایە قەبە قەبەیە بکەن. ئیدی کەوتنە کڕینی ڤێللا و ئەپارتمان لە دوبەی، ترومبێلی گرانبەهایان بۆ ژنەکانیان کڕی و منداڵەکانیشیان ناردنە گرانترین خوێندنگە و زانکۆی بەریتانی و ئەمریکایی. ئیدی خۆشییان لە پارە و سەربەستییەکان بینی، بەڵام پشتگیری ڕژێمیشیان دەکرد، چونکە هەر بەهۆی ڕژێمەوە بوو، ئەوان بەو جۆرە دەوڵەمەند ببوون.

زۆرینەی پیاوە پارەدار و دەستڕۆیشتووەکان لەنێو ئەو توێژە بازرگانانەدا، ئەو کەسانە بوون کە کاریان بۆ سوپای پاسدارانی ئێرانی کردبوو. لە ماوەی ئەو ئابڵوقە تێکدەرانەی نێودەوڵەتییدا کە وەک سزایەک بەسەر ئێراندا سەپێندرابوو، ئێران دەیزانی بە ڕێگەی جیاواز جیاواز خۆی لەژێر باری ئەو ئابڵوقەیەدا بدزێتەوە. کارخانە بیانییەکان، کەرەستە قەدەغەکراوەکانیان لە ڕێی دوبەیەوە دەفرۆشتە ئەو بازرگانانە، ئەوانیش لە ڕێی خۆیانەوە بە قاچاخ دەیانگەیاندە سەر زەمینی دوورگە و بەندەرە ئێرانییەکان. بەم جۆرە بە ملیۆنان دۆلاریان دەستکەوت.

برازای ژنەکەم، کە دەلاڵ بوو، ڕێنوێنی ئەوانەی بۆ لای کاروباری کڕین و فرۆشتنی خانووبەرەی دوبەییەکان کرد. ئیدی لە ڕێی ئەوەوە، ئێمە ئێستا بانگهێشتی خوانی تککەلێدانی کۆمەڵێک لەو بازرگانە هەرە دەوڵەمەندە ئێرانییانە کراوین.

هەموو ئەو زانیارییانەی سەبارەت بەو کۆمەڵە کەسانە، کە لە برازای ژنەکەم وەرمگرتبوو، هیچیانم بە خوشکەکەم نەگوت، دەنا ئەگەر پێمبگوتبا، ئاراستەی سەردانەکە بە جۆرێکی دیکەی لێدەهات. منیش کەسێکی تاسەمەند بووم و ویستم ئەو بازرگانانە لە نزیکەوە ببینم و لەگەڵیاندا

بکەومە قسە، بەشێک لەم هەڵوێستەم لەبەر خاتری دایکم بوو، بەشێکیش لەبەر خاتری کتێبەکەم بوو، کە خەریکی نووسینی بووم.

منیش دڵخۆش بووم کە بە مارسدیسە کەشخەکەوە بەرەو شوێنی تککەلێدانەکە ڕۆیشتم. دەنا دەبوایە وەک بابایەکی نووسەر بچووبام، ئەمەش بە دڵنیاییەوە بە دڵی ژنەکەم نەدەبوو، کە لەنێو ژنانی ئامادەبوو، کە هەموویان ترومبێلی گرانبەهایان هەبوو، هەر یەکەشیان دوو تا سێ پێشخزمەتی تایلەندییان بەکرێ گرتبوو.

دەرگە ئاسنینە گەورۆنەکەی ڤێللاکە کرایەوە، منیش بەنێویدا لێم خوڕی تا گەیشتمە گەراجەکە و ترومبێلەکەم لێ ڕاگرت. هێشتا لە ترومبێلەکەمان دانەبەزیبووین، چەندین کچ و ژنی گەنجی تایلەندی بە پیرمانەوە هاتن. حەفت کچی خزمەتکار؟ دەشکرێ ئەوانە تەنیا بۆ ئەو ڕۆژە بەکرێ گیرابن. هەر چۆنێک بێ، ئەمەش بۆ خۆی ئەزموونێک بوو.

ڤێللاکە پانوپۆڕ و زەبەلاح بوو، هەر دەبێ هی سعوودییێک بێ. ژنەکەم بە تاسە بوو تا ژنەکانیان ببینێ، بێگومان هەر دەبێ کەپوو، گۆنا و چەند شوێنێکی دیاری جەستەیان، بە نەشتەرگەری جوانکاری وا لێکردبێ کە ئێستا هەیانە. لە ئێراندا ئەم جۆرە کارە ئاساییە، لەم ڕۆژانە و لە ئێران لووتێک نابینی، ئەو جۆرە نەشتەرگەرییەی بۆ نەکرابێ.

بە پێچەوانەی ژنەکەم، خوشکەکەم تیشکۆی هزری خۆی خستبووە سەر کچە خزمەتچییە تایلەندییەکان، پێدەچێ ویستبێتی بزانێ، ئاخۆ ئەوان لێرە چی دەکەن، چەند وەردەگرن، ئاخۆ مێردیان کردووە. منداڵیان هەن، یان ئاخۆ ئەوان لە دوبەییدا بەختەوەرن و ئیدی پرسیارگەلی لەو بابەتە.

هەرچی چیرۆکی دایکیشم بوو، شتێکی دیکە بوو. تێبینی ئەوەم کرد، هەر لەگەڵ ئەوەی گەیشتینە ئەوێ، پشتی خۆی ڕاستکردەوە، قیت وەستا. ئەو

هەرگیز شتێکی منی نەخوێندبووەوە، قەتیش لێی نەپرسیم، ئاخۆ دەربارەی چی دەنووسم. بەدەر لەوەی من چی دەکەم، گومانم بۆچی دەچێ، ئاخۆ ئەوەی دەیکەم باشە یان نا، ئەو هەموو متمانەیەکی بە من هەبوو. بۆ ئەوەش ئەو پێویستی بە بیر و بۆچوونی کەسێک نەبوو لەسەر من. ئاخر خۆ ئەگەرێکی دیکە لەگۆڕێدا نەبوو، بەلای ئەو، دەبوایە من هەر باش بم و براپەوە.

کچە تایلەندییە پێشخزمەتەکان یاوەری ژن و خوشکەکەمیان بۆ ژوورەوە کرد، منیش بە هێواشی لەگەڵ دایکم بەرەو ئەو شوێنە ڕۆیشتین کە دووکەڵی تککە و کەبابی لێهەڵدەستا.

نزیکەی پازدە ژن و ئەوەندەش پیاوی ڕیشدار لەپڕێکەوە لەپشت دارەکانەوە پەیدابوون. ئەو ژنانە، هەموویان بە نوێترین جلی مۆدە و لەچکی سەریانەوە هاتن و دایکمیان ماچکرد و پیاوەکانیش بەخێرهاتنێکی تایبەتیان لێکردم. پاشان برازاکەی ژنەکەم هەر پازدە پیاوەکانی بەم جۆرەی خوارەوە پێناساندم:

- ئەحمەد ڕەزائی؛ گەورە بازرگانی پێڵاو و گەنم و جۆرەکانی دیکەی دانەوێڵە.

- عەلی باشی؛ گەورە بازرگانی کەلوپەلی ناوماڵ، وەک بەفرگرە، دەزگای جلشۆر، گسکی کارەبایی.

- ڕەزا قومی؛ گەورە بازرگان لە ئامێر و کەرەستەی کشتوکاڵی وەک تراکتۆر.

- حەسەن ڕەشیدی؛ گەورە بازرگان لە پێخەف، پەتۆ، پەردە و سکەی پەردە.

- جەمال نەجەفی؛ گەورە بازرگان لە چاکەت و پاڵتۆی پیاوان، دوولینگە، کراس و جلەکانی ژێرەوە.

- موحسین ئەراکی؛ گەورە بازرگان لە مریشکی بەستوو هەروەها جۆرە مۆدێلی تایبەتی مارسیدس.

- ناسر زەمانی؛ گەورە بازرگانی گۆشتی بەستوو، بەروبوومی گۆشت و پایسکل.

- جەعفەر فاخر؛ گەورە بازرگانی زێڕ و ئاڵتوون.

- سەمیم ڕاهناڤارد؛ گەورە بازرگانی ماکیاژ و جلوبەرگی ژێرەوە.

- محەمەد کەمال؛ گەورە بازرگانی بووکەڵە و یاری منداڵان و شیری پۆدرە.

- موجتەبا کاشانی؛ گەورە بازرگانی پەنیر، سابوون و تایت.

- زەمان قادری؛ گەورە بازرگانی جۆرەکانی ترومبێل و پارچە یەدەگەکانیان.

- باقر زەنگنە؛ گەورە بازرگانی کۆمپیوتەر و پرینتەر و عەدەسەی چاویلکە.

- ڕەجا ڕەحمانی؛ گەورە بازرگانی پەت و داو، گڵۆپ، چلچرا، مێز و کورسی.

- سالم سابر؛ خودانی ڤێللا جوانەکە، گەورە بازرگانی کوتاڵ، بازرگانی جلی ژنانە، نەخاسمە لەچک و سەرپۆش. "شایانی باسە هەر لە بەر خووخدە و ئارەزووشی بازرگانی بە کەلوپەلی نەخۆشخانەکانیشەوە دەکا." خزمەکەم ئەم قسەیەشی خستە سەر پێناساندنەکە و بە

خەندەیەکیشەوە درێژەی پێدا؛ "چونکە ڕۆژێ لە ڕۆژان حەزی لێبوو ببێتە پزیشک، بەڵام تێیدا سەرنەکەوت."

ئەو پیاوانە خۆشییان لەو پارەیە دەبینی کە ئازادییان بۆ خۆیان و ماڵ و منداڵیان پێ دابینکردبوو، کەچی لە نیشتمانەکەشیاندا ڕێگەیان بە ئازادی ئەوانی دیکە نەدەدا! لەوانەیە ئەوەش دروست نەبێ، من شتەکە گشتگیر بکەم، بەڵام کرۆکی ڕاستی لەو جۆرە بیرکردنەوەیەدا هەیە.

*عاقڵ بە*، وام بەخۆم گوتەوە. *ئەمڕۆ لەگەڵیان بازۆ. تێکەیشتنەکە بەلاوە بنێ و خۆشی ببینە. خۆ خۆشیشە ئەم دۆخە تاقی بکەیتەوە.*

دوای ئەوەی برازای ژنەکەم هەموویانی پێناساندم، بێدەنگییەک باڵکێش بوو.

منیش چاوم لەسەر دایکم بوو. کاتێک لە ڤێللاکە چووینە ژوور، نەمدەزانی ئاخۆ دایکم بیر لە چی دەکاتەوە، بەڵام ئێستا هەست دەکەم، ئەو بازرگانانە دنەی شتێکیان دابێ، چونکە بینیم ڕووخسارە خەمبارییەکەی جارانی بەدیارکەوتەوە.

ئەوەم لێ ڕوون بوو، دەیویست شتێک بڵێ، هەمووان چاوەڕێ بوون. ئینجا دایکم بە قامکی دۆشاومژەی ئاماژەی بە من دا و گوتی: "ئەوەش کوڕەکەمە. ئەو دەنووسێ. کەچی ناتوانێ جارێکی دیکە بگەڕێتەوە نیشتمان."

٣٠

## باقی چیرۆکەکەی نێو ڤێللاکە

**خانەخوێ** و ژنەکەی ڕێنوێنی ئێمەیان بۆ بەر سێبەری دار خورمایەکە کرد، کە لەنزیک شوێنی تکە لێدانەکە بوو. لەسەر مێزەکە هەموو جۆرە شتێکی خۆش، سەلاتە، کولیچە، شەربەتی میوە لەنێو سوراحی گەورۆنە داندرابوون. هەندێک لە دووری ئەوانیشەوە، مێزیکی دیکە داندرابوو، خواردنەوەی توند و بەهێزی جیاواز. ئەو پیاوانەی لە دەوری بوتڵەکان وەستابوون، بەدمەست ببوون، زۆری پێنەدەچوو، لەسەر پێی خۆیان خۆڕاناگرن دەبێ ژنەکانیان بیانبەنەوە ماڵێ.

من ڕێگر نەبووم لەو کارە. لێ ئەگەر لە ئێران لەسەر ئەوە بگیرێی کە خواردووتەوە، شەست جەڵدەت لێدەدرێ. باوک و باپیرانی ئەو پیاوانە لە سەدەکانی ناوەڕاستدا شێلگیر بوونە لەسەر ئەو جۆرە سزادانانە.

هەرچەند من ئێستا نەمدەویست خۆم بەو شتانەوە سەرقاڵ بکەم، بەڵام لە ناخەوە هەستم بە نائاسودەییێک کرد. سەد جاران بە خۆم گوتۆتەوە: *هەمووی بە یەک ڕبە مەپێوە*. هەڵبەتە لەنێویاندا پیاوی باش هەن، بەڵام بە بێ پشتیوانی تەواو و پەسەندکردنی نابینایانەی مەلایەکانی ئێران، ئەو پیاوانە ناتوانن یەک شەنقاو باوێن. ئەوانە سەد لە سەد لێگیراون و پەسەند کراون، ئەوانە هەموو شتێکیش دەکەن، بۆ ئەوەی ئەسپی ئایەتوڵڵاکان نەگلێ. چونکە ئەگەر باری مەلایەکان لەنگ بوو، ئەسپەکەیان گلا، ئەوا ئیمپراتۆریەتی ئەو بازرگانانەش بەسەر یەکدا دەڕمێ.

ئەوەی ئەوانە دەیکەن، کارێکی زۆر ئاسانە. ئەوانە بازاڕی نەریتئاسای ئێرانییان پاوان کردووە. لەبەرئەوەی ژنان هەر دەبێ بە توێزی لەچک بکەن و سەرپۆش لەسەر دابنێن، بەلای کەمی هەر ئافرەتێک پێویستی بە سێ تا چوار لەو پارچە قوماشانە هەیە.

«سالم سابیری» خودانی ڤێللاکە، بازاڕی لەچک و سەرپۆشی قۆرخکردووە. هەر بۆ نموونە دە ملیۆن لەچک و سەرپۆش لە چین بە ڕادان دەدا و دەیهێنێتە دوبەی، لەوێشەوە ڕەوانەی بازاڕەکانی ئێرانی دەکا. لە هەر لەچکێکیش بەلای کەمی سێ یۆرۆی دەستکەوت دەبێ و لەهەر سەرپۆشێکیش یەک یۆرۆ. بەم جۆرە، لە شەو ڕۆژێکدا بیست ملیۆن یۆرۆی لێدەدا و دەیخاتە تەنکەی باخەڵی.

ئاوەها لەگەڵ دایکم تووشی ئەو دانیشتنەی بارزگانە دەستەبژێرەکان بووین. پیاوەکان هەر پێکی کۆنیاک و ویسکییان هەڵدەدا قرتەی پێکەنیشیان ڕۆژە ڕێیەک دەڕۆیی. هەر دەیانویست بەدمەست بن.

هەرچەندە من لە بەدمەستەکان نیم، بەڵام خۆشیی لە دانیشتنی دۆستان دەبینم کاتێ دەخۆنەوە. بەڵام هەرگیز حەزم بە چارەی ئەو کۆمەڵە بارزگانانە نەدەهات. بەڵێ دەکرا لەگەڵیان باسی کاروباری بازرگانی و ژیان لە دوبەی بکەین، بەڵام خۆ ئەوان ئەو دەرفەتەیان نەدامێ، بەڵکو هەر باسوخواسی دیکەیان هەبوو، وەک بردنەوەی دۆناڵد ترەمپ لە هەڵبژاردنەکانی ئەمریکا.

برازاکەی ژنەکەشم، کە ئەویش زۆری خواردبووەوە، لەپڕێکەوە باسی حاڵەتی وڕێنەکردنی دایکمی هێنایە گۆڕێ. پێی ڕاگەیاندن، هەندێ جار ئەو بیرۆکەیەی بۆ دێ گوایە بەرەو مەککە بەڕێوەیە.

ئینجا یەکێک لە بازرگانەکان گوتی؛ "ئۆو، چ خۆشە."

یەکێکی دیکەش هەڵیدایێ؛ "مایەی پێکەنینە."

یەکێکی دیکەش سەری قسەکەی لێوەرگرتەوە و گوتی؛ "دایک و باوکەکانمان تەمەنێکیان بەڕێکردووە، بۆیە گەیشتوونەتە ئەو حاڵەتە ناسکە."

بازرگانێکی دیکەش گوتی: "مامی منیش هەروا بوو. خۆی لە سەرەتاوە وانەبوو. ئەو لەپڕێکەوە ڕۆیشت، بەڵام نەچووە مەککە، بەڵکو گەڕایەوە ئەو گوندەی لێی لەدایک ببوو. یەکەم جاریش ماڵباتەکەی گوێیان پێنەدا، لێیگەڕان بچێتە زێدەکەی، پێیانوابوو هەر بۆ ئەوە چۆتە ئەوێ بەڵکو سەرێکی لای دووکانی کاریی و بەهارات بدا. بەڵام جارێکیان ڕێگەی ماڵی خۆی پێنەزانیەوە. ئەوەبوو یەکێک گەیاندبوویە پۆلیسخانەکە. ئەو کاتەش کە پۆلیس پرسیاریان لە پزیشکی خانەوادەکەی کرد، ئەویش ناوونیشانی ئەو ماڵەی گوندەکەی خۆیانیانی پێدابوو، کە پێش پازدە ساڵ لەوێ باری کردبووە، لە تاران دەژیا."

دیسان یەکێکی دی لە وان گوتی: "داپیرەم لە دایکەوە چەندین ساڵ بوو تووشی دەردی وڕێنەکردن ببوو.

ئینجا برازای ژنەکەشم گوتی؛ "ئەمە چییە؟ خۆ هەر یەک لە ئێمە باوک، دایک، داپیرەیەکی هەر هەیە تووشی ئەو دەردە بووبێ."

"نەخێر، هەر بەڕاستی،" پیاوەکە هاتەوە قسە؛ "ئەو داپیرەیەم چیدی نەیدەناسیمەوە. ئەو ببووە منداڵ. وای ڕەفتار دەنواند، هەروەک ئەوەی کیژێکی شەش ساڵان بێ. ڕۆژێکیان بە خۆی و بووکەڵەیەکی کۆنینەوە بەنێو ماڵەکەدا دەسووڕایەوە. ئێمەش تێنەگەیشتین چۆن دەستی گەیشتە ئەو شتە. ئیدی لەو کاتەوە وازی لەو بووکەڵەیە نەهێنا. قسەی لەگەڵدا دەکا،

جلی لێ دەگۆڕی، لەگەڵ خۆی دەیبردە سەر پێخەفەکەی خۆی. تەنانەت دایکیشم ناناسێتەوە، جیهانەکەی ئەو بۆتە بووکەڵە کۆنەکە. لەوانەیە هەر لە تافی منداڵییەوە ئەو بووکەڵەیەی هەبێ و پاشان کە لە تەمەنی چواردەساڵیدا شووی بە باپیرەم کردووە، لەگەڵ خۆی هێنابێتە تاران. بەڵێ، ڕێک و ڕەوان لە ڕێی ئەو بووکەڵەوە، داپیرەم شەوانە لە کاتی خۆی دەچێتە سەر جێگەکەی خۆی و خەوێکی باشیشی لێدەکەوێ."

لە چاوی ئەو چیرۆکە ناسراو و پڕ لە ئازارانە، حوکمی من بەسەر ئەو دەستە پیاوەدا نەرمونیانتر بوو، باشتر دەمتوانی لەگەڵیان بکەومە قسەوباس. لە پشتەوەش دەنگی موزیکی کەیف و سەفا و دەنگی شادمانی ژنەکانیش دەهات. خوشکەکەشم هەندێک لە دووری ئەوانەوە، لەژێر دارێک بەتەنیا وەستابوو، تێگەیشتم هەست بەخۆی دەکا باش نییە. لەوانەیە ئەو ژن و پیاوانە یادەوەری پڕ لە ژان و بەسوێیان لێ ژیاندبێتەوە.

لەو کاتەی خوشکم خرابووە کونجی زیندانەوە، دەنگۆی وا بڵاو بووەوە، کە پاسەوانەکان وەک کارێکی پیرۆز لەنێو چاوە زیندانەکاندا دەستدرێژی دەکەنە سەر کیژەکان و لاقەیان دەکەن. یەکێ لە دەستە خوشکەکانی خوشکەکەم لە زیندانەکەدا کوژرابوو، لەو کاتەی نەیویستبوو خۆی ڕادەستی پاسەوانەکەی بکا. ئیدی پیاوەکە لە تووڕەییان ئەوەندە بە توند پێلەقەی لە زگی دابوو، کەوتبوو، پاشان هەر بەو هۆیەوە گیانی لەدەستدابوو. لەوانەیە من زاتی ئەوەم نەکردبێ، شتێکی وەها لە خوشکم بپرسم، ئاخۆ ئەو ساڵانەی لە زیندان چۆن تێپەڕیون. یان تۆبڵێی هەر بە خۆی ئەو دەرفەتەی نەدابێ، پرسیارێکی وەهای لێبکەم؟

گوێم لێبوو خوشکەکەم بانگی کردم و منیش یەکسەر بۆ لای چووم.

لێی بپرسیم؛ "بە یارمەتیت دەتوانین لێرە بڕۆین؟"

منیش هێدمەگرتی بووم. باشە بۆچی زووتر بیرم لێ نەکردبووە؟ خۆی دەبوایە وریاتر بوومایە.

پێمگوتەوە: "بێگومان."

ئینجا چووم ژنەکەم ئاگادار کردەوە.

ئەویش پرسی: " چۆن بوو وەها لە پڕێکەوە؟"

- "دواتر پێت دەڵێم بۆ."

- "بەڵام خۆ بێڕێزییە وەها لە پڕێکەوە هەڵبستین و بڕۆین. بەم جۆرە لە لای برازاکەم و برادەرەکانی تووشی شەرمەزاریم دەکەی. باشە بۆچی وا دەکەی؟" بە ناڕازییەوە وای لێپرسیم.

- "داوای لێبورن دەکەم. دواتر شتەکەت پێدەڵێم."

- "خۆ پرسەکە هەر تایبەت نییە بە ئێستا، هەموو کات تۆ هەر وا دەکەی. ئاخر خۆ ئەوە بیرۆکەی من بوو کە بێینە دوبەی تا دایکت و خوشکت ببینین، منیش هەموو شتێکم کرد، کە ئەوان بەختیار بن و ئێرەیان پێ خۆش بێ، بەڵام تۆش هەروەک ئەو بازرگانانە دەجووڵێیتەوە. خۆ ئەوانیش هیچ پرس و ڕایەک بە ژنەکانیان ناکەن. هەر خۆیان بڕیار دەدەن و ژنەکانیشیان دەبێ بە گوێیان بکەن."

- "داوای لێبوردن دەکەم." دیسان هەروام پێگوتەوە.

ئینجا بە دڵشکاوی دەستی دایە جانتاکەی و بەرە و لای تڕومبێلەکە ڕۆیشت.

خوشکەکەشم یارمەتی دایکمی دا تا بیگەیەنێتە نێو ترۆمبێلەکە و لەسەر کورسییەکەی خۆی دایبنیشێنێ.

ئەوسا بە بێدەنگی ئەوێمان بەجێهێشت.

## ٣١

# باخی سێوان

بۆ ئەوەی تۆڵەی ئەو هەڵسانە ناوەختە بکەمەوە، یەکسەر بەرەو باخی سێوان لێمخوڕی، دواتریش لە چێشتخانەیەکی خۆش لابدەین و نان بخۆین.

لەنێو ئەو بڵاونامە زانیارییانەی هوتێلەکەدا، ئەوە هاتبوو کە سەردانکردنی ئەو باخی سێوانە شتێکی دڵڕفێن و ناوازەیە. بەڕاستی هەرواش بوو، ئاخر ئێمە دەستبەجێ کە بینیمان هەر وامان بۆ دەرکەوت. کاتێکیش لەنێو ترومبێلەکە دابەزین و بەرەو نێو باخی سێوان بەڕێکەوتین، پێمان نایە جیهانێکی سەوزی تەڕ و تازە، کە شتێکی وەها لە دوبەییدا هی چاوەڕوانکردن نەبوو. ئەو دار سێوە گەورە گەورانە، جۆرە باخێک بوون لە بەهەشت، کە لە پشت ئەو هەزاران قوللە و بورجی بەرز بەرزرە لێدرابوون. بینینی ئەو سێوە لاسوورە ئاڵتونیانە کە بە دارەکانیانەوە شۆڕ ببونەوە، ئەوەندە خۆش بوو هەر نەبێتەوە، بۆن و بەرامەی ئەوەندە کاریگەر بوو، هەر زوو هەر چوارمان هەرچی بۆن و بەرامەی کەباب و تککەلێدانی ڤێللاکەی بەجێمان هێشتبوو، لەبیرمان چووەوە.

هێشتا دایکم بە باخەکە سەرسام نەببوو، ئەو بە شێوەیەکی ئاسایی وەستابوو، سەیری دەکرد، هەروەک ئەوەی سێوەکان هی باخەکەی ماڵی خۆی بێ. بەڵام خوشکەکەم زۆر بە باخەکە سەرسام بوو. سەری لە لقی دارێکیان بردە پێشەوە، بۆنی سێوە سوورەکانی کرد. منیش هۆنراوەیەکی «هێرمان کۆنینکی»[40] بەلجیکیم هاتە یاد:

---

[40] Herman Coninck

ئۆو، من نازانم،

بەڵام خۆ هەیە، ئای چەند جوانە.

بڵێ: سەیرکە، مەلێک

فێرم بکە چۆن مەل ببینم

بڵێ؛ ژیان نانێکە،

تا بیخۆیت و سێوی سووریش لە دڵخۆشیان، دەی دەی، هێشتا بڵێ.

دەی فێرم بکە بگریم

کاتێکیش دەگریم

فێرم بکە بڵێم: ئەوە هیچ نییە.

چومە لای خوشکم دانیشتم، پێموابوو ئەو ساتە هات تا ئەم پرسیارەی لێبکەم، پرسیارە زۆر گرنگەکە دەبێ ئاشکراو ڕوون بێ: *دەی سەبارەت بەو هەموو سالانەم بۆ باس بکە. ئایا شتێک هەیە، من نەمزانیبێ؟* بەڵام خۆ ئەو بەرەو لای دارسێوێکی دیکە ڕۆیشت و لەوێ لەسەر لمەکەی نوشتایەوە تا بزانێ ئاخۆ چۆن ئەو سۆندە دیارانەی سەر لمەکە، ڕەگوڕیشەی دارسێوەکان ئاو دەدا.

ویستم پێی بڵێم، هەموو ئەو سالانەی ئەو لە زینداندا بوو، من بەختەوەر نەبووم. دەمویست پێی بڵێم، ئەو هەموو سالانە من هیچم نەکرد، لە نووسین زیاتر، ئەمەش وەک خۆسزادانێک بوو تا هاوسەنگییەک بدۆزمەوە. بەڵام نەمتوانی شتەکە دەرببڕم. من دەمویست بڵێم، من نەمدەتوانی لەو ماوەیەی ئەو لە کونجی زینداندا بوو، سەردانی بکەم، من لەو حاڵەدا

نەبووم، بتوانم یارمەتی بدەم، بەڵام لە یەکێک لە کتێبەکانمدا، من ئەوم لە زیندان دەرهێنا[41]. وامکرد هەڵبێ و داڵدەی خۆی لەنێو شاخەکاندا بدۆزێتەوە. من ئەوم بە بەفر و کرێوە بەرەو ئەشکەوتێک نارد و هەموو جێپێیەکانیشم لەسەر بەفر ڕەشکردنەوە، بۆ ئەوەی پاسەوان و یاساوڵەکانی زیندان نەتوانن بیدۆزنەوە. من دەمویست پێی بڵێم؛ پێشتر من نان، خۆراک و جلوبەرگی گەرمم گەیاندبووە ئەشکەوتەکە و لەوێ بۆم ئامادە کردبوو. لێگەڕام لەوێ سێ سەد ساڵ خەوی لێبکەوێ، هەروەک یارانی ئەشکەوت و چیرۆکەکەی نێو قورئانێ. هەنووکەش کتێبەکە، ڕۆمانەکەم لەگەڵ خۆم هێناوە و لەسەر دەشبۆردی ترومبێلەکەم دامناوە. ئای کە چەند بە خۆشحاڵییەوە حەزم لێبوو لە سێبەری ئەو دارسێوانەدا یەک دوو لاپەڕەی بۆ بخوێنمەوە، بەتایبەت دوایین لاپەڕەی:

***ئیدی کاروبار بەم جۆرە ڕۆیشت، پیاوەکانی ئەشکەوت لە کۆتاییدا پەنایان بۆ بن ئەنواکە برد.***

***ئەوان گوتیان: خوایە ڕەحممان پێبکە.***

***لەو ئەشکەوتەدا ئێمە چاو و گوێی ئەوانمان بۆ چەندین ساڵ داپۆشین.***

***کاتێکیش ڕۆژ هەڵدەهات، پیاوەکان ڕۆژیان وا دەبینی کە لە لای دەستە ڕاستی ئەشکەوتەکەوە هەڵدێ.***

***هەر کاتێکیش ڕۆژ ئاوا دەبوو، پیاوەکان ڕۆژەکەیان دەبینی، کە لەلای دەستە چەپی ئەشکەوتەکەوە ئاوا دەبێ.***

***لەوێ لەو نێوانەدا ئەوان خۆیان بینیەوە.***

---

[41] مەبەستی نووسەر لە کتێبەکە خۆشەویستەکەی خۆی، «خەتی بزماری»یە. و.

ئەوان پێیان وابوو بێدارن، کەچی نوستبوون.

ئێمەش ئەوانمان بەسەر لای چەپەو ڕاستەوە وەردەگێڕا.

هەندێک هەبوون دەیانگوت: ئەوان سێ کەس بوون و چوارەمیشیان ئێشکی لێدەگرتن.

ئەوانی دیکە دەڵێن: ئەوان پێنج کەس بوون، شەشەمەکەیان ئێشککریان بوو. خەملاندنێک لە کوێرەڕێدا.

ئەوانەی دەیانگوت سێ بوون، گوتیان : ئەوان حەفت کەس بوون.

کەس نەیدەناسین.

ئێمە ئەوانمان بە ئاگا هێنایەوە، بۆ ئەوەی لەنێو خۆیاندا لە یەک بپرسن.

یەکێک لەوان پرسی: ئێمە لێرەدا ڕۆژێک یان نیوە ڕۆژێک ماوینەتەوە.

دیسان ئەوانی دیکە گوتیان: هەر خوا دەزانێ ئاخۆ چەند لێرە ماوینەتەوە. وا باشترە یەکێک لە ئێمە بە دراوی زیوینەوە بچێتە شار. ئێمە دەبێ وریا بین، خۆ ئەگەر ئەوان بۆیان دەربکەوێ، کە ئێمە کێین، ئەوا بەردبارانمان دەکەن.

دوای گفتوگۆکردنیان، یەملیخا بە خۆی و دراوێکی زیوین لە ئەشکەوتێ هاتەدەر.

کاتێکیش گەیشتە شارەکە، تێبینی ئەوەی کرد، هەموو شتێک گۆڕاوە و لە زمانەکەشیان تێناگا.

ئاخر ئەوان سێ سەد ساڵ لە ئەشکەوتەکە خەوتبوون و بە خۆشیان نەیاندەزانی. پاشان نۆ ساڵی دیکەشیان هاتەسەر.

*ڕۆژێکیان خوشکەکەشم بێدار دەبێتەوە.*

*بە خۆی و دراوە زیوینەکەی نێو مشتی لە ئەشکەوتێ دێتەدەر.*

*کاتێکیش دەگاتە شارەکە، سەرنج دەدا، هەموو شتێک گۆڕاوە.*[42]

بەڵام نەمتوانی بۆی بخوێنمەوە، ئاخر ئەمە کارێکی دەستپێنەکراو بوو.

- "دەی بڕۆین؟ پێموابێ هەموو برسیمانە."

ئەوە هەمیشە هەر ژنەکەم بوو، کە منی دەگەڕاندەوە سەر زەمینی واقیع.

- "بەڵێ، زۆر باشە. دەی با بڕۆین."

[42] شایانی باسە، ئەم چەند دێڕە ئاماژە بۆکراوانە سەرەتا و کۆتایی ڕۆمانەکەی «خەتی بزماری»ین. و.

۳۲

# بەرەو ئەبوزەبی

**ڕۆژی** پاشتر، دوای نانی بەیانی، خۆمان کۆکردەوە و بەرەو «ئەبوزەبی» بەڕێکەوتین، تا مزگەوتە گەورەکەی «شێخ زاید» بە چاوی خۆمان ببینین. کاتێکیش کەلوپەکانم لە ترومبێلەکە باردەکرد، تووشی ڕووداوێکی حەپەسان هاتم.

بینیم هەندێ لە هاوولاتیەکانم، پیاو و ژنانێک لە تەمەنی خۆمەوە، بە خۆیان و هەگبەکانیان بە ئەسانسێرەکە هاتنەخوار و خێرا بەنێو هۆڵی پێشوازی هوتێلەکەدا بەرەو دەرەوە ڕۆیشتن و تاکسییێکیان گرت و یەکسەر بۆ فرۆکەخانە تێیان تەقاند.

دایک و باوکە پیرەکانیشیان نامرادانە لە دەرکەی هوتێلەکە بەچاوی خەمبارەوە وەستابوون بەڕێیان کردن.

منیش لە یەکێ لە هاونیشتمانیەکانم پرسی کە بەخۆی و جانتایەکی گەورە بە ڕوومدا چەقی: "ئەرێ چی لەگۆڕێدایە؟"

"ترەمپ، دۆناڵد ترەمپ لێناگەرێ کەس بگەڕێتەوە،" کابرا وای پێگوتم و خێراش جانتاکەی فڕێدایە نێو سندووقی تاکسییەکە.

دیاربوو سەرۆک ترەمپ بڕیارێکی دەرکردبوو، تێیدا هاتبوو، هاوولاتیە ئێرانیەکان و هی پێنج ولاتی ئیسلامی دیکە بۆیان نییە پێ بنێنەوە سەر خاکی ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا. هەموو ئەو هاولاتییە ئەمریکی-ئێرانیانەی کە بۆ پشوودان چووبوونە دەرەوەی خاکی ئەمریکا، نەیاندەتوانی بگەڕێنەوە سەر ماڵ و حاڵی خۆیان. هەر بۆیە ئەو گەشتیارانە

خێرا جانتاکانیان تێک دەنا، بۆ ئەوەی بە زوویی بگەنە فڕۆکەخانەکان. ئیدی ئەو دیدارە بەهەشتاوییەی ئەو میوانانەی هوتێلەکە لەپڕێکەوە بوە دیمەنێکی جەهەننەماوی.

کۆمپانیاکانی گەشتی فڕۆکەوانیش ڕەتیانکردەووە ئەو جۆرە ڕێبوارانە هەڵبگرن تا بەرەو ئەمریکا بفڕنەوە. ترسوبیم باڵی بەسەر دۆخەکەدا کێشا. منیش لەپڕێکەوە بەو شتەی لە کەللەی دام. هێدمە گرتمی: *تۆ بۆت نییە بگەڕێیتەوە هۆڵەندا.*

ئاخر من نەمدەتوانی ئەو ڕووداوە لەگەڵ ئەو گەشتەی کە کەمێکی دیکە بەتەما بووین بەرەو ئەبوزەبی بیکەین، هاوکێش بکەم.

من دەبوایە لەسەری بنووسم، خۆی ئەوە تاکە هەناسە بوو. ئیدی چوومە سەرەوە و لەپشت مێزی کۆمپیوتەرەکەم دانیشتمەوە.

"ئەرێ ئەوە تۆ خەریکی چیت؟" ژنەکەم وای لێپرسیم.

منیش ئەوەی لە خوارەوە بینیم، بۆم باسکرد.

"ئای چەند ناخ هەژێنە. حەیف بۆ ئەو بەستەزمانانە!" ژنەکەم وای پێگوتم.

ئێمەش ئەو هەواڵەمان بە دایکم نەگوت. هیچ چارەیەکیشمان نەبوو، دەبوایە گەشتەکەمان بەرەو ئەبوزەبی درێژەی پێ بدابایە.

پاشان هەر چوارمان چووینە خوار. هۆڵی پێشوازی هوتێلەکە ئارام ببووەوە، وەک ئەوەی هەر هیچ ڕوووینەدابێ.

هەوڵمدا ئەو دیمەنانەی بینیم لەنێو مێشکمدا نەخشیان بکەم.

"دەی لێمەگەڕێ ترەمپ ئەو گەشتەمان لەبار ببا." من ئەمەم بە زمانی هۆڵەندی بە ژنەکەم گوت، کە لە تەنیشت من لە نێوترۆمبێلەکە دانیشتبوو.

له ئاوێنەی ترومبێلەکەشدا بینیم دایکم بەسەر ڕێگای خەونەکەیدا گوزەر دەکا. خۆی گەشتەکە دەبووە گەشتێکی سەرنجڕاکێش. خوشکەشم لەو بێدەنگییەی نێو ترومبێلەکە بە پرسنییەوە لە هەموو شتێکی دەڕوانی، هاوسەرەکەشم بە گومان بوو لەوەی هەموو شتێک بە باشی بڕوا. منیش لەو دۆخەدا هەموو تیشکۆی هزری خۆم خستەسەر ڕێگەکە، ئاخر نابێ و ناکرێ هیچ شتێکمان بێتە پێش، ڕێگەی حەجمان لێ تێکبدا. منیش نەمدەزانی چی دێتە ڕێگەمان، بەڵام خۆ ئەوە دوا دەرفەتم بوو، تا دوای ئەوە دایکم بە دڵێکی خۆشەوە بەرەوماڵەوە ڕەوانەی بکەمەوە.

ئەمەش دوا دیدارمان دەبێ. لە دیداری داهاتوومان ئەگەری زۆر هەیە، چیدی یەکدی نەناسینەوە. ئەو من وەک کوڕی خۆی و منیش ئەو وەک دایکێک کە دەمناسی، نەیبینمەوە.

زۆریش ڕێی تێدەچێ، ئەویش لە شوێنێک بووکەڵەیەکی شاردبێتەوە. کاتێکیش منداڵ بووم، لەوە تێنەدەگەیشتم، ئاخۆ بۆچی ئەو خۆی لە پەنا پەردە دەنا، تا چیرۆکم بۆ بگێڕێتەوە. هەنووکە پەی پێدەبەم، ئەو بۆیە وای دەکرد، تا خۆی لەژێر ئەو بارە قورسەی ژیان بدزێتەوە کە لەگەڵ پیاوێکی کەڕولاڵ و پێنج منداڵدا بەسەری دەبرد. بەم جۆرە ئەو خۆی دەکێشایەوە و دەچووە نێو دنیای ئەندێشەوە. ئەو بەهرەی چیرۆک گێڕانەوەی هەبوو، کوڕەکەی خۆیشی وەک جەماوەری گوێگر بەکاردەهێنا.

من لە ئاوێنەی ترومبێلەکەوە سەیری دایکمم کرد، ئاگای لە دنیا نەمابوو، بە گەشتە تایبەتییەکەی خۆی سەرقاڵ بوو. منیش بە دوایدا چووم، تاسەمەندیش بووم ئاخۆ دواتر بەرەو کوێم دەبا. هەر خۆشم دەستبارم لەگەڵ گرت. لە ئێستاشەوە دەکرێ ئەڵلا بە خۆی دایکم بەرەو ماڵی خۆی ڕێنوێن بێ. خۆ ئەگەر ئەو هەمەشتزان و هەمەکار بوایە، لەوە زیاتر شتێکی دیکە نەدەکرا.

بەرە بەرە ئێمە ترەمپ و بڕیارنامەکەیمان لەپشت خۆمان جێهێڵا، تا دەهاتیش لە ڕێ بۆم دەرکەوت، ژنەکەم زیاتر بڕوای بە چۆنیەتی ترۆمبێل لێخوڕینم پەیدا دەکرد. ئیدی کەمتر ئاگای لە ڕێگاکە بوو، بۆ خۆی ئاسوودە لێی دانیشت.

لێخوڕینەکە ماوەیەکی خایاند، تا لەسەر ڕێگا پێچاوپێچەکەدا بامدایەوە سەر جادەی خێرا، ئەو شارێگا خێرایەی بەرەو مزگەوتی گەورەی ئەبوزەبی دەڕۆیشت. ئێمە هەموو ئەو قولله و تاوەرە بەرز بەرزانەمان لە دوای خۆمان جێهێڵا و بەنێو بیاباندا لێمان خوڕی.

لەنێو ترۆمبێلەکەدا هەمووان کڕومات بوون، تا چەندیش دوور دەکەوتینەوە، ئەوەندە لەسەر شارێگە خێرایەکە ئارامتر دەبوو. تا وای لێهات ئێمە تاکە ترۆمبێل بووین لەسەر جادەکەدا دەڕۆیشتین.

کاتێکیش لە ئاوێنەکەوە سەیری دایکمم کردەوە، هەستمکرد، ئێمە هەرگیز قسەمان لەگەڵ یەک نەکردووە. پێشتر لەگەڵ یەک نەدواوین هەنووکەش هەر هیچ. یەکەمین جاریش کە هاتە لام لە ئەمستردام، نەمدەزانی چۆن لەگەڵی قسە بکەم. زاتی ئەوەم نەدەکرد بە تەنیا لەگەڵ ئەودا بمێنمەوە، بە پێداگیرییەوە لە ژنەکەم پرسی، بە تەنیا جێمان نەهێڵێ. خۆی ئەگەر وا نەبوایە، ئەوا بێدەنگی باڵی بەسەردا دەکێشان، منیش نەمدەزانی ئەو دیواری بێدەنگییە چۆن بشکێنم.

خۆی بابەت و یادەوەری بێ ژمار هەبوون، دەکرا لەبارەیەوە بدوێین، بەلام خۆ نەدەکرا من ئەوانە بەکاربهێنم تا بیانکەمە سەرەداوی قسەکانم لەگەڵ دایکمدا. هەر لە تافی منداڵیمەوە، دایکم بە ئاگایی یان بە بێ ئاگایی ئەو

مەودایەی نێوانمانی دروستکردبوو. ئەو نەیدەویست من وەک منداڵ ببینێ، بەڵکو وەک پیاوێک ببینێ. ئەمەش کاریگەرییەکی زۆری لە ژیانی مندا پەیداکرد. پێشتر هەرگیز لەسەری نەوەستابووم، بەڵام ئێستا لەو ڕێگە ئارامەدا، دەرکم بەوە کرد، کە من لە ناخی ناخەوەمدا هەرگیز دایکمم خۆشنەویستووە. وەک منداڵێک هەستی کردبێ، دایکی نایەوێ و ڕەتی کردۆتەوە، بۆی نەبوو بچێتە کۆشی دانیشێ.

کاتێکیش یەکەمین دانەی کتێبی خۆم بۆ خۆم دەخوێندەوە، حەپەسام. ئاخر من ئەوەندە بە توندی باسی دایکمم کردووە، هەندی جاریش بە ناشیرین و بێ ڕێزییەوە لەبارەیم نووسیوە، شەرمم لە خۆم کردەوە. ئەوەی من کردم هەرگیز شایستەی ئەو نەبوو. ڕەنگە پێویستی بەوە بکردبایە، هەنووکە لە ڕێی وێژەوە لەگەڵ دایکم بدوێم و خۆی هەر ئەمەش گونجاوترین شوێن بوو، کە ماڵئاوایشی لێبکەم.

ئەو دایکێکی باش بوو بۆ ئێمە، منداڵەکانی بە باشی پەروەردە کردن، ئەو دەبوایە بجەنگێ تا لەکۆتایدا خێزانەکەی بپارێزێ. من دەبوو ئەو ڕۆمانەم حەفت جاران بنووسیبایەوە، تا ڕوویێکی ڕاستەقینە بدەمەوە دایکم. ئەو منی خۆشدەویست و ئەوەش مایەی ئێش و ئازاربوو کە کەسی دیکەی ئەوەندە خۆش نەویستووە.

لەو کاتەی من ترومبێلەکەم لێدەخوڕی، هزرەکانم بۆ هەموو لایەک لە شەقەی باڵیان دەدا، منیش لەسەروبەندی ئەوەدابووم دوودڵ بم. لەوانەشە خوشکم ڕاست بێ، دەبوایە بەردەوام قسەکانمان بۆ دایکمان ڕاست بکردایەتەوە. ئاخر من ئێستا نەمدەزانی دەبێ چی بکەین.

لە دیویکی دیکەشەوە، پیموابوو جیهانەکەی دایکم ڕاستیتیرە لە ڕاستیەکەی دوبەی. منیش شادمان بووم کە دەتوانم ڕینوینی بکەم. ئەوەش تاکە شت بوو، بۆ ئەوم پیدەکرا. ئیستاش کە لەگەڵ ئەو لە سەفەر دام، ڕاستییکی دیکەم بۆ دەرکەوت. من خۆشم وا بینییەوە کە لە ڕیی حەجدا بم. خۆ من ڕینوینی دایکم نەدەکرد، بەڵکو لەگەڵیدا لە کاروان بووم.

من هەمیشە حەزم لیبوو بچمە مەککە، ئەو خەونەش لە ڕیی چیرۆکەکانەوە لە میشکمدا چەقی. هەروەک پیشان ئەو دەیگیڕایەوە: "بە ئەسپایەوە من پەردە کۆنینە، گەورە، قورسە، کەسکە تۆخەکەیماڵی ئەڵلام هەڵدەدایەوە و تەماشای ناوەوەم کرد، سەیری کەلوپەلەکانی ژووری لیدانیشتم کرد. کورسییک کە لەسەری دادەنیشت. قاپقاپە زەردباوەکان و ئاوینە خڕە زیوینەکەی. لەسەر میزەکەشی نان داندرابوو."

وەک منداڵیک کاتێ بەو هزرانەی لەگەڵ خۆی دەبردمە ئەو شوینانە، لە حەپەساویان دەلەرزیم.

من لەسەر ڕیگا و لەو بیابانەدا، لای ئاوفرۆشیک لام دا، ئاوفرۆشەکە بارە وشتریک بوتڵی ئاوی پیبوو. ژنەکەشم چایەی لەگەڵ خۆی هینابوو، ترمزەکەی لە دووکانیکی «سترابوک» کڕیبوو. کاتیشمان بەدەستەوە بوو، من حەزم لیبوو دوای نیوەڕۆیەکی درەنگ بگەینە مزگەوتەکە، تا دایکم بتوانێ نویژی شیوان لە مزگەوتەکەدا بکا. ئەمڕۆش ڕۆژیکی دینی ئاهەنگ ئامیزبوو لە ئەبوزەبی، بە هەزاران کەس بۆ نویژکردن دەچوونە مزگەوتەکە. ئیدی بە هیواشی لیمخوڕی، بەرەو بیابان هاژۆتم، بە شیوەیەکی ئاساییش هیچ گەشتیاریک بەرەو ئەوێ نەدەچوو.

ئیمە لەوێ لەژیر سیبەری دارخورماکاندا چایەخانەیەکی خۆجییمان دۆزییەوە، لەوێ وشتر دەهاتن و دەچوون و هیچ ژنیکیش نەدەبیندرا.

پیاوەکان بە دژداشەی سپی و عەگالەوە وەک سوڵتان دانیشتبون، نێرگلەیان دەکێشا. یەکێ لە پیرە عەرەبەکان چایە، خورما و نانی بۆ هێناین.

ئەوێ شوێنێک بوو، دەکرا بە چەندان سەعات لێی دابنیشم. لەوێ نە تەلەفۆن، نە ئینتەرنێت، نە قاوە و نە ترمزی ستارباکت پێویست نەبوو. لەوێ سەیری بیابانمان دەکرد، تا چاو حوکم بکا هەر ئاسۆ بوو.

دایکم لە تەنیشتم دانیشت و هێشتاش لەنێو تونی بابای پیرییێتیەوە دەخولایەوە. گوێم لێبوو لەبەر خۆیەوە بردەبردێکی لێوەهات، سەرەتا وام زانی، هەر لە خۆیەوە شتێک هاتۆتە سەرزاری، پاشان تێگەیشتم، کە بە دروستی وشە لەدوای وشەی سورەتێک، هۆنینەوەیەکی درێژی محەمەد دەڵێتەوە:

***کاتێ ئەستێرەکان دەرژێن***

***کاتێ چیاکان دەکەونە جوڵە***

***کاتێ ئاژەڵە کێویەکان خڕکراونەوە لای یەکدی.***

***کاتێ ژنییەکان هاروهاجانە هەڵدەستن***

***کاتێ....***

ئەوەم زۆر پێ سەیر بوو، لەکاتێکدا ئەو شتانەی لەبەر بوو، کەچی بەدەر لەوە هەموو شتێکی دیکەی لە بیر چووبووەوە.

بە دانیشتووی لەسەر تەختەبەندە دارەکەی بن سایەی دارخورما، خەریکبوو لە هەموو ئەو سەفەرەی حەجی دایکم بکەومە گومان. بیرم کردەوە بەڵکو ئەو هەروەک جاران بەوە سەرقاڵ بێ چیرۆکم بۆ بگێڕێتەوە، بەڵام خۆ ئێستا ئەو پەڕیوەتە حاڵەتێکی دیکەی ڕۆحی. تۆ بڵێی ئەوە ڕاست

بێ، تۆ بڵێی هێزی شاراوەی وڕێنەکەی هەموو شتێکی لێ بستێنێتەوە، تەنیا هێزی چیرۆک گێڕانەوەکانی نەبێ؟ یان تۆ بڵێی، ئەو هێزی چیرۆک گێڕانەوەیە دوایین شت بێ کە لە دەستی مابێ؟ دەشکرێ لە ڕێی ئەو سەفەرە خەیاڵاوییەیدا، پلانێکی وای هەبێ، کە من، ڕۆڵە لەدەستچووەکەی، بگەڕێنێتەوە بن باڵی خۆی. یاخود ئەو بەو کاروانی حەجەی، کە هەنگاو بە هەنگاو پەرەی پێدەدا، بە لاڕێیەک و لەگەڵ تووڕێکی پڕ لە یادگاری و دیارییدا بەرەو نیشتمان بگەڕێنێتەوە؟ من نەمدەزانی ئاخۆ دەبێ چیبکەم. هەڵستام و وەک وشترێکی سەرلێشێواو بەنێو لمەکەدا غارم دا و پڕ بە دەنگم هاوارک کرد: "کەی ئەستێرەکان دەڕژێن، کەی چیاکان دەهەژێن. کەی دەریاکان هار و هاجانە هەڵدەچن، کەی..."

ئەرێ ئەوە چ واتایەک دەداو من بەرەو کوێ هەنگاودەنێم؟

من بە خۆشم لەوە تێنەگەیشتم و بەرەو هیچ شوێنێکیش نەدەچووم. بەڵام خۆ من نەمدەتوانی ڕاستی و ناڕاستی لەیەک جیابکەمەوە.

ئێمە زیاتر لێمانخوڕی و لە شوێنێکی دیکەش لامان دا، تا کات بکوژین. دایکم و خوشکم خەویان لێکەوتبوو، ژنەکەشم لە تەنیشتمەوە سەیری وێنەکانی نێو مۆبایلەکەی دەکرد. ڕادیۆی ترومبێلەکەش کرابووەوە، لەسەر وێستگەی ئەلجەزیرەدا هەواڵەکانی جیهانی دەخوێندەوە. لەپڕێک باس هاتە سەر لەناوبردنی پیاوێکی ئێرانی لە ئیستەنبوڵ. لەگەڵ بیستنی هەواڵەکەدا، ژنەکەم قیت دانیشتەوە.

دوو کەسی دەمامکدار بە سواری ماتۆڕێکەوە تەقەیان لە بەڕێوەبەری کەناڵێکی تەلەفزیۆنی کرد. کەناڵەکەش یەکێ لە کەناڵە هەرە بەناوبانگەکانی ئێرانی بوو، کە لە ئەمریکاوە پەخشدەکرا، بەرنامەکانی خۆی لە ڕێگەی

مانگی دەستکردەوە بۆ ملیۆنان ئێرانی لە نیشتمان بڵاودەکردەوە، بەرنامەکانیش بە دڵی دەسەڵاتدارانی ئێران نەبوو.

ژنەکەم حەپەسا. "ئای چ ناخۆشە،" ئەو قسەکەی بە هۆڵەندی کرد. "خۆی زۆر چاکمان کرد کە نەچووینە تورکیا."

منیش وا وەڵامم دایەوە: "ئەوە چ گرفت نییە، ئەوان دەستیان دەگاتە هەموو شوێنێک. لە دوبەیش پارێزراو نیت."

"چی قەوماوە؟" خوشکەکەم کە گوێی لە گفتوگۆکەمان بوو، وای پرسی.

"هیچ." منیش وام پێگوتەوە بۆ ئەوەی هیچ ترسێکی لە لا پەیدانەبێ.

بە بێدەنگی زیاتر لێمخوڕی. خۆی نەدەبوایە ئەو هەواڵە، گەشتەکەمان لێ تێکبدا، بەتایبەتیش نەدەبوایە دایکم هەستی پێ بکا. دەسەڵاتدارە ئێرانییەکان دەیانویست بەو کردەوانەیان، ئەوە نمایش بکەن، ئاخۆ کامەیان دەستڕۆیشتووترینیانە. بەڵام خۆ مێشکی مرۆڤ جۆرە سیستمێکی خۆپارێزی وای پەرەپێداوە، لەو جۆرە تاوانانە نەترسێ.

کەمێک دوای ئەوە گەیشتمە ئەبوزەبی. شارەکە ڕوخسارێکی نیشاندا، کە لەگەڵ شوێنە پیرۆزەکان دەگونجا. شوێنەکە زۆر سەوزایی بوو، ئەو گۆمانەی لەوێ لە هەموو لایەک بڵاوببونەوە، لەبن تیشکی ڕۆژدا نایابانە دەبریسکانەوە. لەبەر ڕێگەوبان و گۆڕەپانە نوێیەکانیش، سیستمی ناڤیگێشنەکەمان نەیتوانی ئاراستەی مزگەوتەکە بدۆزێتەوە.

ماوەیەکی پێچوو، تا ئاراستە ڕاستەکەی ڕێگەکەمان دۆزییەوە.

ئینجا لە ناکاو گومبەزی مزگەوتە سپییە گەورۆنەکەمان لێ وەدەرکەت. دیاربوو مەڵبەندێکی دیینی هونەر و بیناسازی عەرەبی بوو. دەق ئەو شوێنە بوو کە پێویست بوو دایکم بۆی بچێ. بەبێ سەردانکردنی ئەو مزگەوتە، گەشتەکەی بە گەشتێکی تەواوکراو دانەدەندرا.

٣٣

## له مزگەوتی گەورەی «شێخ زاید»دا

**ترومبێلەکەم** لە گەراجە بەرینەکەی لای مزگەوتەکە ڕاگرت. لەڕاستیدا خۆ ئەوە مزگەوت نەبوو، بەڵکو نمایشێکی دەسەڵات بوو، یاخود ململانێیەکی شێخ زاید بن سوڵتان ئال نهەیان بوو، تا هەرگیز لەیاد نەکرێ، ئەمەش لەوکاتەی هەستیکرد، هێزی وڕێنەکردن لە لای ئەو، وردە وردە دەیگەیەنێتە جیهانی فەرامۆش.

کاتێ لە ترومبێلەکە دابەزین و بەنێو گەراجەکەدا ڕۆیشتین، لاقەکانی دایکم بینین دەلەرزین. ئاخر ئەو پیرۆزگایە هەروەک ئاسمان وابوو، بێ دەروازە بوو، مرۆ دەیتوانی لە هەموو لایەکەوە بۆی بڕوا. ڕێچکەکانیشی بە گرانبەهاترین مەڕمەڕی دنیا کاشی کرابوو، باخەکەشی وا لێدرابوو هەروەک باخەکانی بەهەشت وابوون، ئەوانەی لە قورئاندا وێنا کراون.

نافوورەی گۆمەکانی لەو گەرمایەدا بە نەرمی دڵۆپە ئاوی تەڕ و فێنکیان بە دەموچاوماندا دەدا. تەنانەت خودی ژنەکەشم، کە هەر حەزی لێنەبوو لەگەڵم بێتە ئەو شوێنە، لە سەرسامیان دەمبەشکەی گرتبوو، واقوڕمانەکەی لە چاوەکانیدا دیاربوو. گڵۆپەکان وردە وردە هەڵبوون، تیشکی پیرۆزێتی پترییان بە مزگەوتەکە دەبەخشی.

ئێمە تازە گەیشتبووینە لای دەروازەی ئاسایشی مزگەوتەکە، لەپڕێکەوە یەک دوو هەزار کەسێکی سپی پۆش، کە جلێکی عەرەبی بوو، بە دروشم کێشانەوە بەدەرکەوتن: دانیشتوانی ئەوێ هەروەک چۆن بۆ نوێژی هەینی ئاوهاش بۆ ساڵڕۆژی کۆچی دوایی شێخ زاید بن ئال نهەیان هاتنە

مزگەوتێ، ئەوەش ئاپۆرایەک بوو، من پێویستم پێی هەبوو، بۆ ئەوەی بە باشی لەگەڵ ناوەڕۆکی گەشتەکەی دایکم بگونجێ.

ئێمە بە ڕیز لەلای دارە ڕووناککراوەکان وەستاین و سەیرمان کردن. لەدوای ڕیزە دوورودرێژەکەی پیاوان، سەد دوو سەد ئافرەتیش بە جلی سپیپۆشەوە دەڕۆیشتن.

ئێمەش دەمانویست بەدوای ئاپۆراکە بچینە نێو مزگەوتێ، بەلام لای دەرگە[43] گەورەکە ڕێگەیان نەداین. وەک گەشتیارێک دەبوایە بە دەروازەی تایبەت بە گەشتیارانەوە بچینە ژوور. دوای پشکنێکی ئاسایشانەی زۆر و لە کۆتاییدا توانیمان بچینە نێو مزگەوتەکە، بەلام لەبەر نوێژی هەینی بۆمان نەبوو بەشە هەرە گرنگەکەی مزگەوتەکە ببینین.

ئای چ حەیف و مخابن بوو، دایکم نەتوانێ ئەو هەینیە، نوێژییان لەگەڵدا بکا. من پاڵێکم بە دایکمەوە نا، تا بۆ پێشەوە بڕواو بە دەرگەوانەکەشم گوت: ئێمە بەتایبەت لە دوبەیەوە بۆ نوێژی هەینی هاتووین."

– "بۆ گەشتیاران قەدەغەیە بچنە ژوور."

– "خۆ دایکم گەشتیار نییە. ئەو بەتایبەت بۆ نوێژی هەینی ئەو ڕێگەیەی بڕیوە. من بەتایبەت ترومبێلێکم بە کرێ گرتووە تا لە کاتی خۆی بیگەیەنمە ئێرە."

---

[43] دەرگە، دەرکە، لەوانەیە لە تێروانینی یەکەمدا یەک واتایان هەبێ، بەلام لە هەندێ دەڤەر، بەتایبەتی لە باڵەکایەتی، جیاوازییان هەیە، دەرگە لە دەرکە گەورەترە.

ئەو هەندێک بیری لە قسەکەم کردەوە و سەیرێکی دایکمی کرد، دیاربوو فڕی بەسەر گەشتیارانەوە نەبوو. ئینجا سەرێکی ڕەزامەندی لەقاند و گوتی: "بەڵام ئێوە نابێ بەو شێوەیە بچنە شوێنی نوێژکردنەکە، دەبێ جلی نوێژکردن بپۆشن." خۆ ئەگەر بمانویستبا بچووباینە ژوور، دەبوایە جلێکی نەریتییانەی ئەوان دژداشەیەکی سپی بوو، کە تایبەت بە گەشتیاران بوو، بپۆشین.

منیش ڕووم لە ژنەکەم کرد.

یەکسەر گوتی؛ "پیاوەکە، من ئەوە لەبەر ناکەم."

خوشکەکەشم نەیدەویست جلەکان لەبەر بکا.

جاری وا هەیە کاتوساتی وات دێتەپێش، سەخڵەت دەبی، یان هەر خۆت بەخۆتەوە سەرسام دەبی. تێگەیشتنەکەم وایپێگوتم، نابێ ئەو دژداشەیە لەبەر بکەم، بەڵام خۆ منیش حەزم لێبوو.

لە ژنەکەم پرسی: "باشە چی دەکەی؟"

"لەگەڵ خوشکەکەت دەچین قاوەیەک دەخۆینەوە، پاشان بەو نێوەدا پیاسەیەک دەکەین تا لە نوێژەکە دەبنەوە."

ئەوان ڕۆیشتن و منیش لەگەڵ دایکم لەوێ مامەوە.

دەرگەوانەکە دژداشەکەی دامێ. لە بەر ئاوێنەدا خۆمم نەدەناسییەوە. باشە چۆن دەتوانی لەبن ئەو بەرگەدا هەڵبکەی، بەرگی ئەو کەسانەی کە هەمیشە باوەڕت وابووە ئەوان ئەلفبێتکە، زمان، موزیک و پەرستگاکانتیان لێ زەوت کردووی؟

خۆی دەبوو من پێبکەنم، چونکە مێژووی ١٤٠٠ ساڵەی ڕابردوو هێشتاش ڕەفتارەکەم دیاری دەکا. تاسەمەند بووم بزانم دایکم چۆنم لێدەڕوانێ، بەڵام خۆ ئەوم نەبینی، ئەو ڕۆیشتبوو. تۆ بڵێی ئەویش لەگەڵ ژن و خوشکەکەم چووبێتە دەر؟ نەخێر، وا نەبوو. من گەڕامەوە لای خاڵی پشکنینی ئاسایشپارێزەکە و لەوێشەوە تەماشام کرد، بەڵام خۆ لەوێش دیارنەبوو. لە گەراجەکەش نەبوو. خێرا چوومە دیوی پشتەوەی شوێنی پاسەوانەکان و لەوێوە زیاتر سەیری مزگەوتەکەم کرد، بەڵام لەوێ لێنەگەڕان زیاتر بڕۆم و پاسەوانەکان منیان گەڕاندەوە لای خاڵی پشکنینی ئاسایش. لەو نێوەشدا کۆمەڵێکی دیکە وەژوور کەوتن. پیاوەکان هەر بە پێوە پشکێندران، ئافرەتەکانیش لەپشت پەردەیەکی ڕەشی تۆخدا ڕیزیان بەست و پشکێندران، لەنێویاندا ئافرەتی گەشتیاریش هەبوون بە خۆیان و جەلەبییە سپییەکانیان. من شتێکی وام بۆهات، بەڵکو دایکیشم لەپشت پەردەکەوە بێ.

هەڵبەتە نەمدەتوانی بچم و ئەودیوی پەردەکە ببینم، ئیدی لەوێوە بانگم کرد: "دایکە! ئەرێ تۆ لەوێی؟"

بەڵام خۆ هیچ وەڵامێک نەبوو.

"ئەرێ دایکە، گوێت لێمە؟ من چاوەڕێی تۆ دەکەم، تۆ لەوێی؟" دیسان وەها بانگم کردەوە.

دیسان هیچ کاردانەوە نەبوو. یەک دوو ئافرەتی moوزەردی ڕۆژئاوایی لەبن جەلەبییە سپییەکانیاندا کە لەپشت پەردەکە هاتنەدەر، پێدەکەنین. دوای ئەوان ژنێکی بەتەمەنی لەڕولاواز بە خۆی و جەلەبییە سپیەکەی لەپشت پەردەکە هاتەدەر. ئەو گەشتیار نەبوو، بەڵکو حاجی بوو، تەزبیحیشی لەدەستدا بوو. ئەو سەیری خەڵکانی دیکەی نەدەکرد، هیچ باکیشی بەو

جەنجاڵییەی دەوروبەری نەبوو. دڵم توند لێیدا و گەرمایيش گەیشتە سەرم و تینی بۆ هێنام.

"دایکە." بە هێواشی وام گوت و بەرەو لای چووم.

بە بێ دەنگی بۆ دەرەوە ڕێنوێنیم کرد. ئێستا هەر نەشمدەتوانی لەگەڵی بدوێم. من نەمدەزانی ئاخۆ بەو جلوبەرگە دڵخۆشە یان نا. لەبن ئەو جەلەبییە سپییەدا، نەمدەتوانی پیلی بگرم. وەک ئەوە وابوو کە هەر دایکم نەبێ.

هێشتا هەر سەر قاڵی ئەوەبووم، ئەو ناوە بناسم و ڕێگەی هۆڵی نوێژکردن بدۆزمەوە، ئیدی لەو کاتەدا سەدان کەس بەجلی نوێژەوە پەیدا بوون. ئەوان دروشمیان دەگوتەوە، کە پێشتر زۆر جار گوێم لێی بووە، ئەویش ئەو دروشمانە بوو کە ملیۆنان لە حاجییەکانی مەککە کاتێ لە کەعبە، لە ماڵی ئەڵڵا نزیک دەبنەوە، بە دەنگ دەیڵێنەوە.

"وحدەهو وەحدەهو لاشەریک لەهـ

لا ئیلاهە ئیللەڵڵا، لا ئیلاهە ئیلا ئیللەڵڵا"

منیش جەزبە گرتمی. ئەو خەڵکەی هاواریان دەکرد، زۆر بیرەوەری تافی منداڵێتییان هێنامەوە یاد. خۆی ئەوەش زۆرباش بوو، کە ژنەکەم نەیبینیم، چونکە منیش لەگەڵ حەشاماتەکە تێمهەڵکرد هەر دەمگوتەوە:

"وەحدەهو وەحدەهو لاشەریک لەهـ"

گەلۆ، خۆ من دیندار نیم، بەڵام بڕوام بە هێزی هەڵچووی بەرجەستەبووی خەڵک هەیە. کەعبەش، ماڵەکەی ئەڵڵا، نموونەیەکە لەوە. ماڵی کەسێکە، کە تەنیا لەنێو حەکایەت و دەقە کۆنەکاندا دەژیێ. "وحدەهو وەحدەهو

وەحدەهو ٚ بۆ ئەوەی کە لە ماڵ نییە. لەسەر بنەمای ئەو بڕوایەدا، پێموایە ئەم نوێژکەرانە لەسەر ئەو ڕێگەیە نین کە ئەڵلا بپەرستن، بەڵکو خەونەکەی دایکم بەدیبێنن. هەرچۆنێک بن، شتەکە کاری خۆی کرد.

گورڕدەمەکە بەتایبەت لە پیاوان پێکهاتبوو. هەر بە تەنیا شەش ئافرەتێک لە پشتیانەوە دەڕۆیشتن.

من و دایکم لەوێ ڕەق بەبێ دەنگی وەستاین، لە پاڵ ڕێگەکەی ئەوان وەستاین، تا هەموویان تێپەڕین. پاشان دایکم بڕیارپێدا ڕەگەڵ دەستەی شەش ژنەکان بکەوێ. منیش بە مەودایەک لە دوای ئەوەوە ڕۆیشتم، تا چاوم لێیبێ.

گوڕدەمی خەڵکەکە گەیشتە نێو مزگەوتەکە. ئەوەی لەوێ بینیم، لە شوێنی خۆ ڕەق و بێدەنگی کردم. تومەز بێگومان شێخ زاید بن سوڵتان ئال نهەیان بە دروستکردنی ئەو مزگەوتە خۆی بە نەمری هێشتبووەوە، ماڵە نمایشێکی نموونەیی بۆ ئەڵلا. بەڵام تا ئەو ڕادەییەی ئەڵلام ناسیبێ، دڵنیابووم ئێرەی بە دڵ نەبووە.

من بە دوای نوێژکەراندا لە هۆڵێکەوە بۆ یەکێکی دیکە ڕۆیشتم. لە ڕاستیدا خۆ ئەوانە مەودای نوێژکردن نەبوون، بەڵکو پیشەنگای هونەری عەرەبی بوو: داری ئاڵتونی بە گەڵای نایابی کەسکی گەوهەر و بەردەمرواری کە تیشکی ڕووناکایی دەدایەوە.

ئەو نوێژکەرانە زۆرجار دەبینران، بەنێو ئەو بۆشاییە ئەفسووناویەی نێو مزگەوتەکەدا ڕۆیشتن، زۆری پێناچێ نوێژەکەیان دادەبەستن.

لەنێو ئەو هەموو نوێژکەرانەدا، من تاقانە بووم، هەروەک منداڵێک بە سەرسامییەوە سەیری ئەو هەموو پارچە هونەرییانەی دەوروبەرم دەکرد.

هەر لەبەر ئەوەش بوو، بوومە جێسەرنجی ئاسایشپارێزەکان و لەپڕ گەیشتنە سەرم. ئەوسا تێگەیشتن کە من و دایکم گەشتیاری ڕۆژ بووین، بە جلی نوێژکەرانەوە ڕەگەڵ تەوژمی گوڕدەمەکە کەوتبووین و خۆمان بە نێو مزگەوتەکەدا کردبوو. یەکێ لە پاسەوانەکان بە غار بەرەو لامان هات، ڕێگەی پێگرتین و بە عەرەبی پێیگوتین:

- "بگەڕێنەوە، وەختی نوێژە، ئێرە جارێ بۆ گەشتیاران قەدەغەیە."

- منیش پێمگوتەوە: "ئاخر ئێمەش دەمانەوێ نوێژ بکەین."

- "نەخێر، جارێ نا، دواتر، دوای تەواوبوونی نوێژی هەینی."

- "ئاخر خۆ دایکم بەتایبەتی بۆ نوێژی هەینی هاتووە. قەیناکا من لێرە دەمێنمەوە، بەڵام لێگەڕێ با ئەو بڕواتە ژوورەوە، خۆ جەلەبیشی لەبەردایە."

- "ئێستا نا. دواتر، دوای تەواوبوونی نوێژەکە." دیسان پاسەوانەکە هەر وای پێگوتینەوە.

- "ئاخر خۆ بۆ ئەللا هیچ جیاوازی نییە، کە کێ بێتە ماڵەکەی ئەو نوێژ بکا." هەوڵمدا کەم تا زۆر بە عەرەبییەکی دروست وای پێبڵێم.

- "نەخێر، نا، قەدەغەیە. حەرامە."

هەوڵمدا ڕکێفی خۆم لە دەست دەرنەچێ، چونکە نەمدەویست سەردانەکەی دایکم لێرە لە لای پاسەوانەکەی مزگەوتێ کۆتایی پێبێ. هەروەها ئەوەشم نەدەویست پیلی بگرم و بە یەکەوە بچینە قاوەخانەیەک، قاوەیەک لەگەڵ پارچە کێکێک بخۆین و بەس. هەر بۆیە بە نەرمییەوە پاڵم بە دایکمەوە ناو بە پاسەوانەکەشم گوت: "ئەو دەچێ نوێژ دەکا. تۆش نابێ ڕێگەی لێبگری."

"ئێستا نا. دوای نوێژەکە!" وای پێگوتم و پاڵێکیشی پێوە نام. ئینجا چوو لەبەردەم دایکیشم وەستا، دەستی دایە بێسیمەکەی و بە عەرەبی شتێکی گوت. لە ماوەی یەک دوو خولەکدا دوو هەیتەی دیکە هاتن، دوای ئەوەی تێبینییان کرد، ئێمە ئێرانین، ڕەوشەکە خراپتر بوو، لە دەست دەرچوو. لە هیکەوە هەموو ئەو جەنگە ئایینیە مێژوویانەی نێوان فارسەکانی سەردەمی کۆن و عەرەبەکان سەری هەڵدایەوە.

ئەوان سوننە بوون و دایکم و و منیش لە چاوترووکانێکدا بووینە شیعە. ئاخر نوێژکردنەکەی سوننەکان جیاوازە لە هی شیعەکان. ئەوان لە کاتی نوێژدابەستندا دەستەکانیان دەخەنە سەر یەک و لەسەر سینگ دایدەنێن، لە کاتێکدا شیعەکان باسکەکانیان لە تەنیشت یەکدی بۆ خوارەوە بە هەر دوولای ڕاستەو چەپدا بەردەدەنەوە. ئیدی ئێمە نەدەبوایە تێکەڵیان بین. لە سەرووی هەمووشیەوە، هەرای «یەمەن» لەگۆڕێدابوو، لەوێ شەڕێکی گەرم لەنێوان شیعە و سوننەدا هەڵگیرسابوو، هەروەها لە سووریاش جەنگ هەبوو، کە ئێران و جیهانی عەرەب بەرانبەر یەک وەستابوونەوە.

"دەی بۆ دەرەوە!" یەکێ لە هەیتەکان بەو دارەی لەنێو دەستی دابوو، ئاماژەی بۆ ئاراستەی گەراجەکە بۆ کردین.

ئەوان وایان ڕەفتار لەگەڵ کردم، وەک ئەوەی من لە نەخشەم دابێ، بچمەژوورەوە و مزگەوتە گەورەکەی «شێخ زاید بن نهەیان» بتەقێنمەوە. کاتێکیش مەلای مزگەوتەکەم لەگەڵ کۆمەڵێک لە پیاوی سەروڕیش بۆز بینی، کە لە دەرگەیەکی دیکەدا دەچوونە شوێنی نوێژکردنەکە، بانگم کرد: "هۆو، ئیمام! دایکم دەیەوێ نوێژ بکا، بەڵام ئەوانە لێی ناگەڕێن بێتە ژوور."

ئیمام هەر خۆشی لە گوورە نەبرد. پێدەچوو عەرەبییەکەی من وەک وەرگێڕانەکەی «گوگل» بێ. کەواتە دەبوو ئێمە دەفن بین[44].

کارێکی گەوجانە بوو لەگەڵ ئەو هەیتانە سەبارەت بە مێژووی جەنگە ئۆلییەکانی بەسەرچوو بکەوینە مشتومڕ. دەبوایە بیر لە شتێکی دیکە بکەمەوە، تا هەر چۆنێک بێ دایکم بگەیەنمە نزیک ئەڵڵا.

تاکتیکێکی ئەزموونی ڕابردووی سیاسییم بە کەڵک هات: هەنگاوێک بکشێوە دواوە، بۆ ئەوەی دواتر بتوانی دوو هەنگاو بێیتە پێشەوە. ئیدی پیلی دایکم گرت لەوێ ڕۆیشتین، بۆ ئەوەی هەیتە و پاسەوانەکان هەست بکەن دەمەقاڵێیەکەیان بردۆتەوە. ئێمە لە شوێنی نوێژکردنەکە دەرچووین، بە یەکەوە تا ئەو شوێنەی دەکرا بڕۆین.

بە مەزندەی من، دایکم هەستێکی وای هەبوو، ئێمە ئێستا لە «المسجد الحرام»، لە گەورەترین مزگەوتی جیهاندایین، لەو شوێنەی کە کەعبەی لێیە. ئەو سەیری ئەو هەموو زێڕ و گەوهەرانەی دەکرد کە دەقە پیرۆزەکانی پێنووسراونەتەوە، لە بانەوە بە بنمیچەکەوە دەبریسکێتەوە. کاتێکیش نوێژەکە تەواودەبێ، ئەوا دەتوانێ جارێکی دیکە بێتەوە ئەو شوێنە و بیبینێ.

دوای کەمێک ڕۆیشتن، چووین لەوێ لەسەر تەختەبەندێک دانیشتین تا پشووییێک بدەین. لەوێ نیگام کەوتە سەر خانووییێک کە پاسەوانێکی چەکدار بە جلی ئاڵووالای یەکپۆشی بۆنەیەکی تایبەت ئێشکگر بوو. پێدەچوو مەزارێک بێ. منیش لە شوێنی خۆم هەڵسام، بەرەو ئێشکگرەکە

---

[44] دەفن بوون، بڕۆ دەفن بە! ئیدیۆمێکە بۆ ڕۆیشتنێکی ناچار، یان ڕۆیشتن لە ماڵێک کە بەخێرنەهێندرابێ و فەرمووی لێنەکرابێ، بەکار دێ. و.

چووم. ئەو بێدەنگییەی نوێژکردنم قۆستەوە و بە پاسەوانەکەم گوت: "سەلامون عەلەیکم. ئەری ئەم شوێنە چییە؟"

من دەبوایە هەموو توانام بەکاربهێنم، تا شێوەزارە قوڕسە عەرەبیەکەی تێبگەم. خۆ ئەگەر هەڵە نەبووبم، ئەو ئێشکی لە گەنجینەیەک دەگرت، کە تەنیا میوانە پلەبەرزەکان دەیانتوانی سەردانی بکەن. بۆ گەشتیاران نەبوو پێ بنێنە ئەوێ.

منیش پرسیم: "باشە بۆ چی، ئەو چ جۆرە گەنجینەیەکە؟"

ئەگەر باش تێگەیشتبم، لەوێدا شێخ زاید بن سوڵتان ئال نهەیان نێژراوە. هەروەها چەندین کەلوپەلی گرنگی هەندێ لە سوڵتانەکان لەوێ هەڵگیراون. هەر لەوێ شوێنێکی تایبەتیش بە پێڵاو، شمشێر، عەبا و مۆری پێغەمبەر محەمەد هەبوو. یەکەمین دانەی قورئانیشی لێبوو، کە دانەیەکی سەد کیلۆ قورسە، بە دەستخەتی کوفی لەسەر کەوڵی گوێرەکە نووسرابووەوە.

"یەکەمین دانەی قورئان؟ کەوش، عەبا و مۆرەکەی محەمەد؟" من وام لێپرسی.

ئەویش سەری لەقاند.

کەواتە ئێرە ئەو شوێنەیە، دەبێ دایکم ببینێ. بەڵام چۆن بتوانم ببەمە ژوور؟

لای خۆم خەمڵاندنێکم کرد؛ پیاوەکە و گەلایەک لە پارە کە وێنەی شێخ زاید بن سوڵتان ئالنهەیانی لەسەربێ، بیدەمێ. بەڵام خۆ ئەو کارەم مەترسیدار بوو، لەوانەبوو یەکسەر لەوێ دەرمان بکا. خۆ ئەگەر بمەوێ شتێک بە دەست بێنم، دەبێ ڕاستگۆیانە بۆی بچم. منیش کەوتمە سەر گێڕانەوەی بەسەرهاتەکەی خۆم:

- "ئەم پیرەژنە دایکمە. ناوی شابانووە، واتای شازادە دەدا.

پاسەوانەکە نیگایەکی لە دایکم بڕی.

پێمگوت کە دایکم لە تاران دەژی و خۆشم لە ئەمستردام و ناشتوانم بگەڕێمەوە نیشتمانەکەم. هەر بۆیەشە وامکردوە بێتە دوبەی تا ببیینم، لەوانەیە ئەمە دوا دیدارمان بێ. هەروەها دەربارەی وڕێنەکانیشم بۆ باسکرد. گوتم هەمیشە دایکم خەون بەوە دەبینێ، بچێتە مەککە و ئێستاش پێیوایە ئێمە لە «المسجد الحرام» داین.

پاسەوانەکە هیچ کاردانەوەیەکی نەنواند. من دەبوایە پەلە بکەم، خەریکبوو نوێژەکەش تەواو دەبوو. بە دوودڵییەوە پرسیم:

- "ئەگەر زەحمەت نەبێ، دەتوانی شتێک بۆ دایکم بکەی؟"

دیسان پاسەوانەکە سەیرێکی دایکمی کردەوە کە بە ڕێز و حەپەسانەوە سەیری گوڵە ئاڵتوونیی و دینگەکانی مەزارەکەی دەکرد.

کابرا پرسی:

- "چی؟"

- "لێبگەڕی با پێڵاو و عەبا و شمشێر و مۆرەکەی پێغەمبەر ببینێ."

- ئەو سڵەمیەوە: "نەخێر، نەخێر! هیچ کەس بەدەر لە سوڵتان و پاشا و سەرۆک دەوڵەتان نەبێ، بۆیان نییە بچنە ژوورەوە."

- "من ئەوە دەزانم. بەڵام تۆ دەتوانی وەها بکەی کە ببێ. دەی لێبگەڕێ با دایکم پێڵاوەکانی محەمەد ببینێ." ئەمەم بە شێوەیەکی لێبڕاوانە پێگوت.

نازانم بۆچی پاسەوانەکە دوای ساتێ بێدەنگی، دیسان نیگایەکی برِیە دایکم. ئەوسا، هەروەک ئەوەی ئەڵلا کارەکەی ڕێکخستبێ، پاسەوانەکە بەرەو ڕووی دایکم ڕۆیشت، دەستە گەورەکەی لەسەر شانی داناو بە نەرمی بەرەو دەرکەی مەزارەکەی پاڵ نا. دەرکەکەی کردەوە و لێگەڕا دایکم بچێتە ژوور.

لەمە باشتر نەدەکرا، دەبوو خواوەند هەر خۆی کاروباری دایکم ڕێکبخا. مەزنایەتی پیرۆزێتی ئەو لەو ساتەدا لەوێ ئامادە بوو. من نەمبینی، بەڵام ئەو لەوێ بوو.

ئێنجا چوومە لای حەوزە ئاڵتوونییەکە، دەست و چاوم شوشتن و هەندێک ئاوم بەسەر سەرمدا کرد تا لە ئانوساتەکەدا بژیم. بینیم لە دوورەوە ژنەکەم وەستابوو، منیش چوومە لای.

بە سەرسوڕماوییەوە پرسی: "ئەرێ بۆ وا تەڕی؟ دایکت لەکوێیە؟"

- "لە ژووری گەنجینەکەیە؟"

- "چی؟ لە کوێ؟"

منیش وەڵامم نەدایەوە، ئاخر خۆ ناتوانی ئەو جۆرە شتانە ڕوون بکەیتەوە. لێم پرسی: "ئەدی خوشکم لە کوێیە؟"

- "من چووزانم. جارێکی دی لەگەڵ ئێوە بۆ هیچ شوێنێک ناڕۆم. هەموو شوێنێکی بە دوادا گەڕام، نازانم لە کوێیە."

- "لەوانەیە چووبێتە کتێبخانەکەی مزگەوتێ. خێرا دەچم چاوێکی لێدەکەم."

خوشکم لە کتێبخانەی مزگەوتێ نەبوو. لەوانەیە چووبێتە هۆڵی نوێژ. ئێستاش لە نوێژ بوونەتەوە، هەر دەبێ لەگەڵ نوێژکەران بێتەدەرەوە. بەڵام خۆ لەپێشدا دەبێ بچم دایکم بهێنمەوە.

پاسەوانەکەی مەزارەکە لەوێ، لەبەردەم دەرگەی مەزارەکە ڕەق و بێدەنگ وەستابوو، تێبینیشم کرد، نایەوێ لەگەڵم بدوێ. منیش ئاوها لەوێ بۆ ماوەی دە خولەکێک لەلای دینگەکە وەستام. لەبەرئەوەی دایکم هەر نەهاتە دەر، بە پاسەوانەکەم گوت:

- "ئەرێ دەکرێ دایکم بهێنیتە دەر؟"

ئەویش چووە ژوور، بەڵام بەبێ دایکم هاتە دەرەوە.

- "ئەو لەوێ نەماوە، بە دەرکەی پشتەوە چۆتە دەر."

منیش غارم دایە دەرکەی دەرەوەی تەلارەکە، کە پاسەوانێکی دیکەی لێوەستابوو.

- "ئەرێ هۆ پاسەوان، بەڵکو بزانی پیرەژنێک تازە لێرە هاتبێتەدەر، بۆ کوێ چووە؟"

ئەویش ئاماژەی بە شوێنی نوێژ کرد، هەنوکەش زۆر جەنجاڵ بوو. منیش هەموو سووچێکی بۆ گەڕام، بەڵام لە هیچ شوێنێک نەمدۆزییەوە.

بینیم خوشکەکەم لە دەرەوەی گوڕدەمی خەڵکەکەوە دەڕۆیشت. دەستێکم بۆ هەڵوەشاند و بانگم کردێ: "دەی وەرە! دایکە ڕۆیشتووە!"

- "چۆن، بۆ کوێ؟"

– "خۆ ئەگەر بچیتە لابالّی ژنەکان بگەڕێی، ئەوا منیش دەچمە دەرەوە لێی دەگەڕێم. دەترسم لەگەڵ نوێژکەرە ژنەکان چوبێتە دەر."

خوشکەکەم بۆ ژوور و منیش بۆ دەرەوە غارم دا، چوومە لای پاسەکان، کە هەندێ دوورتر لە دەروازەکە وەستابوون. چومە نێو پاسەکان، بینیم ژنەکان دانیشتون، بەڵام دایکم لە هیچ کونێک دیار نەبوو.

گەڕامەوە لای هۆڵی نوێژان. ئێستا ژنی لێنەماون، ئەو پەردەیەی ژن و پیاوی لەیەک جیادەکردنەوە لادراوە، بەڵام خۆ هیچ ئافرەتێک لەوێ نەماوە، بەتاڵوحەتاڵ. لە ڕێی دەرکەیەکی دیکەوە خێرا چوومە دەر و چوومە لای خاڵی پشکنینی ئاسایشپارێزی، چوومە لای ئەو شوێنەی، کە دایکم جەلەبییە سپییەکەی لێوەرگرتبوو، بەڵام خۆ لەوێش نەبوو. دیسان گەڕامەوە شوێنی نوێژان، ئێستا شوێنەکە بۆ گەشتیاران کراوەتەوە. شوێنەکە پڕ لە میوان بوو.

بێهودە هەوڵمدا ئەوە بێنمە پێش چاوی خۆم، کە مێشکی کەسێکی وڕێنەکار چۆن کار دەکا. خۆ ئەگەر هێشتا مێشکی کاری بکردبایە، ئەوا هەر لەو شوێنە دەمایەوە کە لێی بزر بووە، یان دەگەڕێتەوە ئەو جێیەی کە جەلەبیەکەی لێوەرگرتووە. هەڵبەتە من دەکرا لەڕێی بڵندگۆکەوە بانگی بۆ ڕابێرم، لێ، پرسیارەکە ئەوە بوو، ئاخۆ ناوەکەی خۆی بەبیر ماوە.

بە دڵەڕاوکێیەوە لە دەرگە گەورەکەی شوێنی نوێژان وەستام، چاوم بەنێو ئاپۆرای گەشتیاراندا گێڕا. لە هیکەوە ڕووداوێکی تافی منداڵیم بە مێشکدا گوزەری کرد. هەینێ، دوای نیوەڕۆیەک کە لە قوتابخانە دەگەڕامەوە، دایکم لە ماڵەوە نەبوو، ئەمەش شتێکی ئاسایی نەبوو. کەمێک لەسەری وەستام، لێ کاتێک ئەو هەر نەهاتەوە، هەستم کرد شتێک لە ئارادایە. خێرا بەرەو بازاڕ ڕامکرد، تا مامم لێ ئاگادار بکەمەوە. بە هەناسە بڕکێیەوە گوتم:

- "دایکم لە ماڵێ نییە.
- "لەوانەیە لای دراوسێکان بێ."
- "نەخێر، لەوێش نییە."
- "بەڵکو لای بەهاراتفرۆشەکە بێ."
- "نەخێر، لەلای بەهاراتفرۆشەکەش نییە. هەموو شوێنێکی بە دوادا گەڕام."
- "لەپشت پەردەکەش نییە؟" مامم وای لێپرسیم.

پێدەچوو مامم لە ڕەوشە ناچارییەکە گەیشتبێ، چونکە لە شوێنی خۆی هەڵسا، دەستی دایە چاکەتەکەی بە لۆقی گەورە گەورە بەرەو ماڵ هات. منیش بەدوایدا ڕۆیشتم. ئەو هەر بە پێڵاوەوە لێ وەژوور هۆدەی دانیشتن کەوت، لەباری ئاساییدا هەرگیز وای نەدەکرد، کەمێک لەپێش پەردەکە وەستا، کە هۆدەی لێدانیشتنی لە کۆگاکە جیادەکردەوە، ئەوسا پەردەکەی هەڵدایەوە. دایکم لەوێ، لەپشت پەردە دانیشتبوو. کەنەفت و ماندوو دیاربوو، وەک ئەوەی هیچ چیرۆک نەمابن تا بیانگێڕێتەوە.

ئیدی لە پڕێکەوە لەوە تێگەیشتم، لێرەش لەنێو مزگەوتەکەدا، لە هەموو شوێنێک هەر پەردەیە و هەڵواسراون. شێتانە بەنێو ئاپۆراکەدا بەرەو لای پەردەکان غارمدا و پەردەکانم هەڵدەدەدانەوە سەیری پشتەوەیانم کرد.

بە دەستی لەرزۆکەوە و بەنەرمی پەردەکانم تی دەدان. لەوێ بوو، دایکم بە بێ دەنگی لەوێ وەستابوو. ئەو هیچ چیرۆکی پێنەمابوو، گەیشتبووە کۆتاییەکەی. تەواو بوو.

سەیرێکی کردم، نەیناسیمەوە.

منیش ئەوم نەناسیەوە.

دایکم ڕۆیشتبوو.

٣٤

# گەڕانەوە بۆ ماڵ

**لە** دوایین ڕۆژدا دایکم و خوشکم لەگەڵ خۆم بردنە سەر دەریا. بەکرێگرتنی ترومبێلەکەشم بۆ ڕۆژێکی دیکە درێژکردەوە و بەرەو سەر کەناراوەکە کەوتینە ڕێ. ژنەکەشم بڕیاریدابوو ئەو ڕۆژە لەگەڵ ژنی برازاکەی بەسەر ببا.

دایکم بە خامۆشی لەپشتی ترومبێلەکە دانیشتبوو، لە ڕەوشێکی وا دوورەپەرێز بوو، نەماندەتوانی لەگەڵی بکەوینە پەیوەندی. بە باشی هەستی دەکرد، کە دوا ڕۆژی بەیەکەوە بوونمانە. لەوانەیە هەر لەبەر ئەوەش بێ، لە دوێنێوە کەوتبێتە ئەو دۆخە.

بە فرمێسکەوە خوشکەکەم دەیویست بانگی بکا.

منیش پێمگوت: "تکایە، لێیگەڕێ. با بە کەیفی ئەو بێ."

ترومبێلەکەم لەوێ لە شوێنێک ڕاگرت، یارمەتی دایکم دا، تا دابەزێ. پێموابوو کەناراوەکە لە خەڵک سیخناخە، بەڵام خۆ هیچ کەسی لێنەبوو. هەروەک ئەوەی سەردانکەرانی سەر زێ زانیبێتیان ئێمە دەچین، ئیدی ڕۆیشتبن و مەیدانەکەیان بۆ ئێمە چۆڵ کردبێ، ویستبێتیان لەگەڵ دایکم و خوشکم بەتەنیا بم. پاشان بۆم دەرکەوت، ئێمە بەشێکمان لە شوێنە گەشتیارییەکان، ئەو شوێنەی قاوەخانە و چێشتخانەی لێن، تێپەڕاندووە. ئێمە گەیشتبووینە شوێنێک کە هەر لم، زێ، ڕۆژ و بای لێ هەبوو.

ئینجا هەر لەوێ ڕایەخێکم لەبن دارخورمایەکی تاقانە ڕاخست، تا دایکم لە سایەی دارەکە و لەسەر لمەکە دابنیشێ. ئەویش تیلەچاوێکی تێگرتم، لەوانەیە بۆ دوایین جار سەیری کوڕەکەی بکا. یان لەوانەیە ئەو پیاوێک ببینێ کە نەیدەناسی، دەریا شینەکەی لە پشتە و ڕۆژیش لەسەر سەریەوە دەدرەوشێتەوە؟

خوشکەکەم ئەوەندە لە دەریا نزیک کەوتبووەوە، شەپۆلەکانی زێی دەگەیشتنێ و نەدەگەیشتنێ. باش هەر گەمەی بە قژەکەی دەکرد. ئاسمان ئەوەندە ساماڵ و ساف بوو، لەو ساتەدا لە دووری دوورەوە، هێڵێکی زەردباوی وڵاتەکەم دەبینی. بەڵێ ئەوێ لە پشت دەریاکە، نیشتمانمە،ماڵمان و پەردەی ماڵمان لەوێ بوو.

بەڕاستی ساتەوەختێکی دانسقە بوو، دایکم لە لای خۆی نەبوو، خوشکیشم بە بێدەنگی پێی لەسەر ئەوە دادەگرت، کە ئەوان منیان خۆشدەوێ و حەزیان لێیە لەگەڵ خۆیان بمبەنەوە نیشتمان. لەپڕێکیشەوە هەر بە جلەکانی خۆی ڕۆیشتە نێو دەریاوە. سەرەتا پێموابوو هەر دەیەوێ پێیەکانی لەنێو ئەو دەریا شینە خوداییەدا تەڕ بکا، کە تا نیشتمان درێژ دەبێتەوە، بەڵام خۆ ئەو زیاتر ڕۆیشت و بەرەو قووڵایی ئاوەکە چوو.

منیش هەر لە شوێنی خۆمەوە تەماشام دەکرد، پێموابوو بەڵکو دەیەوێ مەلە بکا، ئاخر خۆ پێشتر کەس لە ماڵباتەکەمان، لە شارەکەمان، لە وڵاتەکەمان مەلەی نەدەکرد. منیش پێشتر مەلەم نەدەکرد، لە ئەمستردام کەمێک فێربوم. خۆی هەر دەبێ وابێ، چونکە ئاو لە هەموو لایەکەوە هۆڵەندای بەر هەڕەشە داوە. هەنووکە هەرچۆنێک بێ دەتوانم تا بیست مەتر مەلە خۆ بگرم، هەروەها دەتوانم لەسەر پشتیش بۆ یەک دوو خولەک لەسەر ئاو بوەستم. لە حاڵەتی ناچارییشدا دەتوانم کەمێکی دی بڕ بکەم، لەوەش پتر پێویستم پێی نەبوو.

بەم جۆرە لە نێو لمەکە وەستابووم، سەیری خوشکم دەکرد، تا دەهات زیاتر دەچووە نێو دەریاکە، لە هیکەوە هەستێکم بۆ پەیدابوو، دۆخەکە دۆخی تەنگانە و ناچارییە.

هاوارم کرد: "بوەستە!"

بەڵام خۆ ئەو وەڵامی نەبوو، لەوانەیە گوێی لێم نەبووبێ، هەروەک چۆن دایکم لە بن دارخورمایەکە گوێی لێمنەدەبوو.

"دەی بوەستە!" دیسان بانگم کردێ، ئەم جارەیان توندتر.

نەخێر، ئەو گوێی لەمن نەبوو.

هەستمکرد ئەوان هەردووکیان ڕۆیشتوون و منیان بە تەنیا جێهێشتووە. ئیدی بە جلەوە، تەنانەت بە پێڵاویشەوە، غارم دا، هەوڵمدا بە مەلە بگەمە خوشکەکەم.

بەڵام وام هاتە بەرچاو، ئەستەمە بیگەمێ.

ئایی خودایە! باشە بۆ وای کرد، باشە بۆچی هەر بەرەو قووڵایی دەریاکە دەڕوا؟

من مەلەم دەکرد و سەیری دایکیشم دەکردەوە، کە وەک کۆتەڵێک لەسەر ڕایەخەکەی بن دارخورمایەکە دانیشتبوو. لەوە زیاتر نەمدەتوانی، دەمێکە بیست مەتر مەلەم تێپەڕاندووە. ئینجا خۆم خستە سەر پشتم، هەوڵمدا لەسەر ئاو بمێنمەوە، بەڵکو بتوانم هێشتا بیست مەتری دیکە مەلە بکەم. دیسان مەلەم کردەوە، ئێستا خوشکەکەم لێ بووە هێڵێک کە لە دوورەوە دیار بێ.

لەپڕێکەوە تێگەیشتم، ئاخۆ خوشکەکەم چ نەخشەیەکی هەبوو، ئەو دەیویست من زیاتر بەرەو نیشتمان کێش بکا. ئۆو، گەڕانەوە بۆ ماڵ.

کار بەم جۆرە ڕۆیشت و لە هیکەوەش گەڕانەوەم لەبەرچاوان بووە شتێکی نەکردە. خۆی دەبوایە زیاتر بۆ پێشەوە بڕۆیشتمایە. دەی هێشتا بیست مەتری دیکە، ئینجا کەوتنەوە سەر پشت تا هەناسەیەکم بێتەوە بەر.

ئیدی هەموو شتێک گەیشتە کۆتاییەکەی خۆی، مەودای دەریاش کە لەنێوان من و نیشتمان بوو، کۆتایی هات.

- کۆتایی -

# ڕوونکردنەوەیەک

لەبەر هۆکاری قانونی، ناوەکانی هوتێل، نووسینگەی گەشتیاری و بارزگانەکان گونجێندراون.

هۆنراوەکەی هێرمان کۆنینک لە کۆبەرهەمە دووبەرگییەکەی وەرگیراوە.

## چەند سەردێڕێک لە ژیاننامەی وەرگێڕ

- ❖ لە ١٩٦٨ لە گوندی گرتک لە دۆڵی ڕوستێی دەڤەری باڵەکایەتی لە دایک بووە.
- ❖ لە ١٩٨٨دا بە کالۆریۆسی لە قانون لە زانکۆی بەغدا وەرگرتووە.
- ❖ لە ١٩٩٧ەوە تا ٢٠١٢ ئاوارەی ئەورووپا (هۆڵەندا و بەریتانیا) بووە.
- ❖ لە پاڵ زمانی زگماکیدا؛ زمانەکانی عەرەبی، هۆڵەندی و ئینگلیزیش دەزانێ.
- ❖ لە ١٩٨٦ەوە هەوڵی نووسینی داوە. تا ئێستا ١٤ کتێبی لە زمانەکانی هۆڵەندی و ئینگلیزییەوە وەرگێڕاون. دەیان وتار و لێکۆڵینەوەی قانونی و سیاسیشی بڵاوکردوونەتەوە.

# چاپکراوەکانی وەرگێڕ

1. نهێنییەکانی مۆساد، نووسینی گۆردۆن تۆماس، وەرگێڕان لە زمانی هۆڵەندییەوە، سێ جار چاپکراوەتەوە؛ چاپی یەکەم ٢٠٠٨ چاپخانەی هێڤی، هەولێر. چاپی دووهەم دەزگەی چاپ و بڵاوکردنەوەی ڕۆژهەڵات، هەولێر ٢٠١٤. چاپی سێهەم ڕۆژهەڵات ٢٠١٦.
2. مادلین ئۆلبرایت، سیاسەتی ئەمریکا و ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، وەرگێڕان لە هۆڵەندییەوە، سەنتەری نما ٢٠٠٩، هەولێر.
3. داود بنگۆریۆن، دامەزرێنەری دەوڵەتی ئیسرائیل، نووسینی ڕۆبەرت سەنت یۆهن، وەرگێڕان لە هۆڵەندییەوە، چاپخانەی هێڤی ٢٠١١، هەولێر. چاپی دووەم ناوەندی ئاوێر ٢٠١٦ هەولێر.
4. کوردستان لە نێوان سیڤەر و سنوورە دەستکردەکاندا، نووسینی: هیسەر لێهر واگنەر. مێژوو. وەرگێڕان لە ئینگلیزییەوە. چاپی یەکەم؛ لە بڵاوکراوەکانی ئەکادیمیای کوردی هەولێر ٢٠١٣. چاپی دووەم، ئاوێر ٢٠١٥.
5. وەرزێکی سپیی وشکوبرینگ، ئەندریێ برینک. ڕۆمان. وەرگێڕان لە ئینگلیزییەوە، ناوەندی ئاوێر بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە، هەولێر ٢٠١٣.
6. ژیانی من، چۆن ئیسرائیل دامەزرێنرا؟ گۆڵدا مایەر، یاداشت، وەرگێڕان لە ئینگلیزییەوە، ناوەندی ئاوێر، هەولێر. ٢٠١٤.
7. ئینفێرنۆ، دۆزەخ، دان براون، ڕۆمان، وەرگێڕان لە ئینگلیزییەوە، ناوەندی ئاوێر بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە، هەولێر ٢٠١٥.
8. شەرەف، ئەلیف شەفەق، ڕۆمان، وەرگێڕان لە ئینگلیزییەوە، ناوەندی ئاوێر بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە، هەولێر ٢٠١٥.

9. یاخیبوون، مناحیم بێگن، یادەوەری، وەرگێڕان لە ئینگلیزییەوە، ناوەندی ئاوێر بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە، هەولێر ٢٠١٦.
10. خانووەکەی مزگەوتێ، قادر عەبدوڵلا، ڕۆمان، وەرگێڕان لە هۆڵەندییەوە، ناوەندی ئاوێر بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە، هەولێر ٢٠١٦.
11- کۆدەکەی داڤینشی، دان براون، ڕۆمان، وەرگێڕان لە ئینگلیزییەوە، ناوەندی ئاوێر، هەولێر ٢٠١٦.
12- خەتی بزماری، ڕۆمان، قادر عەبدوڵلا، وەرگێڕان لە هۆڵەندییەوە، ناوەندی ئەندێشە، سلێمانی ٢٠١٧.
13- کردە هەرە گرنگەکانی مۆساد، میخائیل بار زۆهار و نەسیم میشال، وەرگێڕان لە ئینگلیزییەوە، چاپخانەی حەمدی، ٢٠١٨ سلێمانی.
14- لە مەککە، قادر عەبدوڵلا، ڕۆمان، وەرگێڕان لە هۆڵەندییەوە، چاپخانەی حەمدی، ٢٠١٨ سلێمانی.



"کارێکی زۆر جوانە، کە بەم شێوازە کتێبەکانم دەکەونە بەردەستی خوێنەرانی کورد. ئاخر ئەوان خەڵکێکی نایابن، هیوادارم چێژ لە خوێندنەوەیان ببینن.
سڵاوم بۆ خوێنەرە کوردەکانم هەیە. باپیرە و داپیرەی کچەکانم کوردن و خەڵکی «کرماشان» و «سنە»ن. کەواتە ئێمە کوردمان خۆش دەوێن. جوانی و دڵڕفێنیی کوردستانیش لە ڕووخساری کیژەکانمدا دەبینمەوە."